# ٢٠٠
# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

نووسینی : سیروان کاکە أحمد
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی
چاپی دووەم ١٤٤١ك- ٢٠٢٠ز
١٤* ٢١ سم ، ١١٧ لاپەڕە
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٦٠٢ ) ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

رَبِّ يَسِّر أَعِن، يَا كَرِيم

## پێشەکی

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێ کردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەڕزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره»[1].

لەم فەرموودە دوعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.

بێگومان لە خزمەت دابوونی قورئان، واتە: لە خزمەتدا بوونی خوای بەرز! چ خۆشحاڵیەکی تێدایە کاتێك بەندە لە خزمەتی پەروەردگاری خۆیەتی و گوێی بۆ گرتوە، وە دەست گرتن و کارکردن بە قورئان، هۆکارە

(١) أخرجه أحْمَد: ١٦٧٨٤، وصحَّحَهُ شعيب الأرنؤوط.

بۆ بە دەستهێنانی سیفەتە بەرزەکانی قورئان، بۆ وێنە: قورئان مەزنە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، مەزن دەبێ، قورئان خۆشەویستە هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، خۆشەویست دەبێ، قورئان بەخشندەیە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێ، بەخشندەو سەخی دەبێ..

دیارە لە خزمەت دابوونی فەرمووده شیرینەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، واتە: لە خزمەت دا بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەمان ئەو سیفەتانەت پێ دەبەخشێ کە قورئان بە خاوەنەکەی و هاوەڵەکەی دەبەخشێ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کردارو گوفتارو ڕەفتارو گشت هەڵسوکەوتەکانی قورئانێکی بەرجەستە کراو بوو کە لەسەر زەوی دەڕۆیشت... پێشم وانیە هیچ کاتێك وەك ئێستا مسوڵمانان ئاوا موحتاجی ئەوە بووبن جارێکی دی بچنەوە قوتابخانەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك قوتابیەك لە خزمەتی لەسەر چۆك دابنیشن و گوێ لە فەرمایشتە موبارەکەکانی ڕابگرن و لەبەری بکەن و تێیبگەن و کاری پێبکەن و خۆیانی پێ برازێننەوە، پاشان خەڵکی لێ فێر بکەن.

ژیان لەگەڵ فەرمووده شیرینەکانی خۆشەویستی خوا ﷺ تام و چێژو لەززەتی تایبەتی خۆی هەیە، ژیانە لەگەڵ بەڕێزترین مەخلوق، ژیانە لەگەڵ سەرەتای هاتنی وەحی و نبووەت، ژیانە لەگەڵ جیلێك کە باشترین جیلی سەر زەوی بوون و (خیر القرون) بوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، ژیانە لەگەڵ دونیایەکی زۆر جیا لەم دونیا ماددیە وشکە!

## پێگەی سوننەت لە ئیسلامدا

گومان لەوەدا نیە کە ناحەزان و تێنەگەیشتووان لە ئیسلام بە جۆرەها شێوە دێن گومان لەسەر ئیسلام دروست دەکەن و دەیانەوێ بە فووی دەمیان ڕووناکی خۆری ئیسلام بکوژێننەوە، ئەم کارەشیان بەردەوامە، یەکێك لە کارەکانیان بریتیە لە هەوڵدان بۆ ڕەت کردنەوەی سوننەت بە گشتی، وە دەڵێن: قورئان بە تەنیا کافیەو پێویستمان بە حەدیس نیە، مەبەستیش لەم بانگەشە پیسە لە ناوبردنی شەریعەتی ئیسلامە، چونکە دیارە سوننەت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئانە، بۆیە تانەدان لە سوننەت، تانەدانە لە قورئان، ئا ئەم بانگەشە پووچە لە کۆتایی جیلی زێڕینی هاوەڵان سەری هەڵدا، وردە وردە تەشەنەی کرد تا دواتر گەیشتە ئەم نەوەی ئێستا.

ئیتر بەردەوام زانایان بەرپەرچی گومانەکانیان داونەوە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، وە ئێمە هەر زۆر بە کورتی ئاماژە بە چەند بەڵگەیەك دەکەین کە گەورەیی و پێگەی سوننەتمان بۆ دەردەخەن، بۆ هەر کەسێك کە خوا ڕێنمایی بکات و خۆشی بە دوای هەقدا بگەڕێ.

دەڵێین: سوننەتی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی موعتەبەری لەسەرە کە بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، سوننەت هەم وەك چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان بە بەڵگە دەهێنرێتەوە، هەم وەك خۆی کە بۆ حوکمێکی سەربەخۆ گوتراوە، وە چەندین بەڵگە لە قورئان هەن فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺو، شوێنکەوتنی سوننەت، وە بە پێچەوانەوە هەڕەشەو وریاکردنەوەی زۆر هەن بۆ ئەوانەی پێچەوانەی سوننەت هەڵسوکەوت دەکەن، با سەرنجی چەند دەقێك بدەین:

دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خوای پەروەردگاریش خۆشتانی دەوێ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴿٨٠﴾ ﴾النساء، تا لێرەدا خوای پەروەردگار گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری ﷺ بە گوێڕایەڵی خۆی داناوە.

دوا ئایەت ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونی فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴿٧﴾ ﴾الحشر، واتە: هەر شتێك لە فەرمان کە پێغەمبەر بۆتانی دێنێ و پێتان دەڵێ وەری بگرن و جێبەجێی بکەن، وە کە قەدەغەشتان دەکات لە هەر شتێك، وازی لێ بێنن و ئەنجامی نەدەن.

کە هیچ گومان لەوەدا نیە، ئەم دەقە هەم وەرگرتنی قورئان و هەم وەرگرتنی فەرموودە دەگرێتەوە.

لە ڕاستیدا بەبێ سوننەت هیچ کەسێك ناتوانێ دینداری بکات، ئێمە وەك مسوڵمانان ڕۆژانە پێویستیمان بە فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، تا لە کاروباری ژیانی ڕۆژانەمان بە کاریان بێنین و بە پێی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتار بکەین.

## دەربارەی: دەست گرتن بە قورئان و سوننەت

١- {عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «أَطِيعُونِي مَا كُنْتُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ، وَعَلَيْكُمْ بِآيَاتِ اللّهِ، أَحِلُّوا حَلَالَهُ وَحَرِّمُوا حَرَامَهُ»}[١].

**واتە: عەوفی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گوێڕایەڵیم بکەن هەتا لە نێوتانم، وە دەست بە قورئانەوە بگرن، حەڵاڵی بە حەڵاڵ بزانن، وە حەرامیشی بە حەرام بزانن.**

تێبینی: **ئەم فەرموودە ئەوەمـــان پێ دەڵێ: کە خۆشەویست ﷺ زۆر بە ڕوونـی زانیویەتـی کەسانێك دوای خۆی پەیدادەبن گوێڕایەڵی ناکەن و فـــەرموودەکانـی بە ڕاست نازانن، بۆیە کە لە دنیـا بووە زۆر تەئکیدو جەختی لەوە کردۆتەوە کە گوێڕایەڵی بکرێ، بۆ ئەوەی ئەم فەرمایشتە موبارەکانەی ببێتە پەندو عیبرەتێکی گرنگ بۆ ئێمەو مانان، کە شوێن سوننەت بکەوین.**

٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللّهِ وَسُنَّتِي، وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دڵنیابن دوای خۆم دوو شتم بۆ بەجێ هێشتوون هەرگیز گومڕا نابن پاش (دەست گرتنتان بەو دوو شتە)، ئەوانیش: قورئان و فەرموودەکانی منن، وە لێك جیاواز نابنەوە تا پێم دەگەنەوە لەسەر حەوز. (فەرموودە بە مانای**

---

(١) أخرجه الطَّبَرَانِي في «الكبير»: ٦٥، انظر: صحيح الترغيب والترهيب رقم: ٤٣.

(٢) أخرجه الحاكم في المستدرك: ٣١٩ وغيره، وحسنه الألباني في المشكاة: ١٨٦، وصَحِيح الْجَامِع: ٢٩٣٧، ٣٢٣٢.

**کردارو گوفتارو هەر شتێك کە پێغەمبەر ﷺ پێی ڕازی بووبێ، با قسەشی لەسەر نەکردبێ، یان خودی خۆی ئەنجامی نەدابێت).**

٣- {عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللّهِ ﷺ صَلَاةَ الْفَجْرِ، ثُمَّ وَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللّه كَأَنَّهَا مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فَأَوْصِنَا، فَقَالَ: «أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللّه، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ كَانَ عَبْداً حَبَشِيّاً، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافاً كَثِيراً، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْمُحْدَثَاتِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ»}[١].

**واتە: عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین، دوایی (ڕووی تێکردین) ئامۆژگاریەکی زۆر کاریگەری کردین، کە چاوەکان فرمێسکیان لێهات، دڵەکان لەرزین و ڕاچڵەکین، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئامۆژگاریەت وەك ئامۆژگاری کەسێکە ماڵئاوایی بکات، (کەواتە) ئامۆژگارییمان بکە، فەرمووی: ئامۆژگاریتان دەکەم بە پارێز کردن لە خوا، وە گوێڕایەڵی و فەرمانبەری بۆ (بەرپرسانی خۆتان) ئەگەر ئەو بەرپرسە کۆیلەیەکی حەبەشەییش بێ، چونکە هەر کەس لە ئێوە دوای من بمێنێ ناکۆکی زۆر دەبینێ، بەڵام ئێوە ڕێبازی من بگرن، وە ڕێبازی جێنشینە ڕێنماییکراوە سەر ڕاستەکان بگرن، وە بە ددانەکانتان بیگرن (واتە: بە هەموو جەستەو دڵتانەوە پێوە پابەندبن)، وە خۆتان لە شتە پەیدا کراوەکان دوور بگرن (کە لە ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە)، چونکە هەموو پەیدا کراوێك (کە لەگەڵ ئیسلام تێکنەکاتەوە) داهێنراوەو، هەموو داهێنراوێکیش (بەو شێوەیە) گومڕاییە.**

---

(١) أخرجه الترمذيّ: ٢٦٧٦، انظر: صحيح الترغيب والترهيب: ٣٧.

٤- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الْمُتَمَسِّكُ بِسُنَّتِي عِنْدَ اخْتِلَافِ أُمَّتِي، كَالْقَابِضِ عَلَى الْجَمْرِ»}[١].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی دەست بە سوننەتی منەوە دەگرێ، لە کاتی ڕاجیایی ئۆممەتەکەم، وەك ئەو کەسە وایە دەست بە پشکۆی ئاگرەوە دەگرێ (کە مەبەست ئەوەیە دەبێ ئارامی زۆر بگرین لە دینداریی).**

٥- {عَنْ مَسْرُوقٍ: قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا): صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئاً فَرَخَّصَ فِيهِ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً»}[٢].

**واته: مەسروق دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: پێغەمبەر ﷺ کارێکی کردو ڕوخصەتی ئەنجامدانیدا (بۆ خەڵکی)، کۆمەڵە کەسێك خۆیان بە دوور گرت (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، وەك بڵێی پێیان دروست نەبوو)، جا ئەم (هەواڵ)ـە گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش وتاری داو، سوپاسی خوای کردو، فەرمووی: ئەمە چیانە کۆمەڵە کەسێك خۆیان بە دوور دەگرن لە شتێك کە من ئەنجامی دەدەم؟! دە بە خوا من لەوان باشتر خوا دەناسم و، لەوانیش زیاتر لێی دەترسم.**

٦- {عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ أَحْيَا سُنَّةً مِنْ سُنَّتِي فَعَمِلَ بِهَا النَّاسُ، كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، لَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئاً، وَمَنْ ابْتَدَعَ بِدْعَةً فَعُمِلَ بِهَا، كَانَ عَلَيْهِ أَوْزَارُ مَنْ عَمِلَ بِهَا، لَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِ مَنْ عَمِلَ بِهَا شَيْئاً»}[٣].

---

(١) ذَكَرَهُ الحَكِيم: (٣٢٧/٢)، أخرجه الكلاباذي في بحر الفوائد: ٣٣٨ ، انظر: «صَحِيح الجَامِع»: ٦٦٧٦ .

(٢) أخرجه البخاري: ٥٧٥٠.

(٣) أخرجه إِبْنُ مَاجَهْ: ٢٠٩، انظر: «صحيح ابن ماجه»: ١٧٣.

**واتە: عەمڕی کوڕی عەوفی موزەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوننەتێکی من زیندوو بکاتەوەو خەڵکیش کاری پێبکەن، ئەوە پاداشتی وەك ئەو کەسانەی هەیە کاری پێدەکەن، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم ببێتەوە، وە هەرکەسێك داهێنراوێك (لە دیندا) دابهێنێ (کە لە ئیسلامدا جێگەی نەبێتەوە)، خەڵکیش کاری پێبکەن، ئەوە گوناهی ئەو کەسانەشی لەسەرە کە کاری پێدەکەن، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهی ئەوان کەم ببێتەوە.**

**٧-** {عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئاً عَلَى أَرِيكَتِهِ، يَأْتِيهِ الأَمْرُ مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ، أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ، فَيَقُولُ: لا أَدْرِي، ما وَجَدْنا فِي كِتَابِ اللَّهِ اتَّبَعْنَاهُ»}[1].

**واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە یەکێك لە ئێوە نەگەم و نەیبینم کە لەسەر لاتەنیشتێك دانیشتوەو، کاتێك دەربارەی شتێك فەرمانێك، یان قەدەغەیەکی منی بۆ دێ، دەڵێ: من نازانم (یانی: بڕوام پێی نیە)! ئەوەی لە قورئان بینیمان، شوێنی دەکەوین (واتە: شوێن حەدیس ناکەوین)!!**

**٨-** {عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِ يكَرِبَ الْكِنْدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُوشِكُ الرَّجُلُ مُتَّكِئاً عَلَى أَرِيكَتِهِ، يُحَدَّثُ بِحَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِي، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ مِنْ حَلَالٍ اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ مِنْ حَرَامٍ حَرَّمْنَاهُ، أَلَا وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِثْلُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ»}[2].

**واتە: میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبی کیندیی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزیکە (خەریکە ڕۆژگارێك دێ) پیاوێك لە شوێنێك پاڵدەداتە سەر لاتەنیشتەکی، فەرموودەیەکی من بگێڕدرێتەوەو بڵێ: ئێمە**

---

(١) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «الكبير»: ٩٣٤، انظر «صحيح الجامع»: ٧١٧٢.

(٢) أخرجه إِبْنُ مَاجَه: ١٧٢٣٣ انظر: صحيح وضعيف «سنن إبن ماجه»: ١٢.

کتێبی خوامان لە نێوانە، ئەوەی تێیدا دەستمانکەوت حەڵاڵ بوو، ئەوە بە حەڵاڵی دەزانین، ئەوەی تێیدا دەستمانکەوت حەڕام بوو، بە حەڕامی دەزانین (دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:) ئاگادارو وریابن! ئەوەی پێغەمبەری خوا حەڕامی کردوە وەك ئەوە وایە خوا کە حەڕامی کردوە. (ئەم حەڕام کراوە با لە قورئانیش نەبێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆوە فەرمایشت نافەرموێ).

٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ فُرِضَ عَلَيْكُمْ الْحَجَّ فَحُجُّوا»، فَقَالَ رَجُلٌ أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَسَكَتَ حَتَّى قَالَهَا ثَلَاثًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ»، ثُمَّ قَالَ: «ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: ئەی خەڵکینە! حەجتان لەسەر فەرز کراوەو، حەج بکەن، پیاوێك گوتی: ئایا هەموو ساڵێك (حەجمان لەسەر واجبە) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەریش ﷺ بێدەنگ بوو، تا سێ جار دووبارەی کردەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر (لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا) گوتبام بەڵێ، لەسەرتان واجب دەبوو، لە تواناشتاندا نەبوو، پاشان فەرمووی: شتێك کە من وازم لێ هێناوەو باسم نەکردوە، ئێوەش لێمگەڕێن، (لێم مەپرسن)، چونکە ئەوانی پێش ئێوە بە هۆی زۆر پرسیار کردنیان و ڕا جیاییانەوە لەگەڵ پێغەمبەرانیان لە ناوچوون، جا ئەگەر فەرمانم پێکردن بە شتێك، ئەوەندەی ئەنجام بدەن کە دەتوانن، وە ئەگەر شتێکم لێ قەدەغە کردن، لێی دوور بکەونەوە.

---

(١) أخرجه مُسلِم: ٦٠٦٨.

**لەم ئایەت و فەرموودانە، چەند شتێکی گرنگ هەن[1]:**

١- هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەو شتەی کە خوا بڕیاری لەسەر داوە بۆ بەندەکانی، لەگەڵ ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری لەسەر داون، وە سەرپێچی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك سەرپێچی کردنی خوای پەروەردگارە، وە گوناهێکی دیارو ئاشکراشە.

٢- دروست نیە بە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ بکەویت (لە هیچ کارو بارێکدا)، هەروەك چۆن دروست نیە پێش خوای بەرزو مەزن بکەویت، ئەوەش حەرامێتی سەرپێچی کردنی پێغەمبەری خوای ﷺ لێ دەفامرێتەوە، پێشەوا (إبن القیم) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبی (إعلام الموقعین) (٥٨/١) دەڵێ: شتێك نەڵێن تا ئەو دەیفەرموێ (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ)، وە فەرمان بە هیچ شتێك مەکەن تا ئەو فەرمان دەکات، وە فەتوا دەربارەی هیچ شتێك مەدەن تا ئەو فەتوا دەدات، وە هیچ شتێك مەبڕنەوەو بڕیاری لەسەر مەدەن، تا خۆی حوکم لە بارەی ئەو شتە دەداو کارەکە دەبڕێنێتەوە.

٣- بێگومان ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، گوێڕایەڵی خوای بەرزی کردوە.

٤- زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە: گەڕانەوە بۆ لای خوا واتە: گەڕانەوە بۆ کتێبەکەی، گەڕانەوەش بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، واتە: گەڕانەوە بۆ خودی خۆی تا ئەو کاتەی لە ژیاندا ماوە، دوای خۆشی گەڕانەوەیە بۆ سوننەتەکەی، ئەمەش لە مەرجەکانی ئیمان هەژمار دەکرێ.

٥- شەرع وا دەڕوانێ کە ڕازی بوون بە نەگەڕانەوە بۆ لای سوننەت لە کاتی ناکۆکی و ململانێ، هۆکاری فەشەلی مسوڵمانانە لە هەموو ئەو تێکۆشانانەی دەیکەن، وە هۆکاری بە هەدەردانی هێزو شکۆمەندیانە.

---

(١) الحدیث حجة بنفسه في العقائد والأحكام، المؤلف: محمد ناصر الدين الألباني، ص٣٢ -٣٦.

٦- ترساندن و ئاگادار کردنەوە لە سەرپێچی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەی کە ئەم کارە چارەنووسێکی خراپی هەیە لە دونیاو دوارۆژدا.

٧- ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن خۆیان تووشی فیتنە دەکەن لە دونیادا، وە لە دوارۆژیشدا خۆیان شایستەی سزایەکی بە ئێش دەکەن.

٨- وەڵام دانەوەی بانگەوازو فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ واجبە، وە هەر ئەمەش هۆکاری بە دەست هێنانی خۆشبەختی دونیاو دوارۆژە.

٩- یەکێك لە سیفەتەکانی مونافیقان کە ئیمانیان بە دیار خستووەو کوفریان لە ناخیان پەنهان کردووە ئەوەیە کاتێ بانگ دەکرێن بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ و سوننەتەکەی دادوەریان لە نێواندا بکات گوێی پێ نادەن و پشت هەڵدەکەن.

١٠- بەڵام ئیمانداران بە پێچەوانەی مونافیقان ڕەفتار دەکەن، کاتێ بانگ دەکرێن بۆ دادوەری کردن لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، دەستپێشخەری دەکەن لە وەڵامدانەوە، بۆیە بە زمانی کردار بە زمانی گوفتار دەڵێن: (گوێمان گرت و گوێڕایەڵ بووین)، بەم کارەیان لە سەرفرازان دەبن، وە لەو کەسانە دەبن کە بەهەشتی نەبڕاوە بە دەست دێنن.

١١- هەر شتێکی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانمان پێ دەکات پێویستە لەسەرمان شوێنی بکەوین، وە هەر شتێکیش کە ئەو لێمان قەدەغە دەکات پێویستە دەستی لێ هەڵگرین.

١٢- پێغەمبەری خوا چاو ساغ و پێشەوای ئێمەیە لە هەموو کارو فەرمانێکماندا، ئەگەر ئێمە لەوانە بین کە دەست بە ڕێبازەکەیەوە بگرین.

١٣- ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەری بڕیوە لەو شتانەی کە پەیوەندی بە دین و بە شتە پەنهانەکانەوە هەیە، کە بە عەقڵ و ئەزموون درکیان

پێ ناکرێ، ئەوە لەو شتانەن کە بە وەحی لەلایەن خواوە بۆی دابەزیوە، هیچ باتڵێکی تێدا نیە.

١٤- سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕوونکەرەوەی ئەوەیە کە لەلایەن خواوە بۆی دابەزیوە.

١٥- قورئان بێ نیاز نیە لە سوننەت، بەڵکو سوننەت هاوشێوەی قورئانە لە ڕووی پێویستی بە گوێڕایەڵی کردن بۆی و شوێنکەوتنی، ئەوەشی کە خۆی بێ نیاز دەکات لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە سەرپێچی پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە، ئەو کەسە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ نیە، وە سەرپێچی هەموو ئەو ئایەتانەشی کردوە کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن.

١٦- ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردوە، وەك ئەو شتانەیە کە خوا حەرامی کردوە، بە هەمان شێوە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا هێناویەتی و لە قورئاندا نەهاتووە وەك ئەوە وایە لە قورئاندا هاتبێ، لەبەر گشتێتی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: {ئاگاداربن! من قورئان و هاوشێوەی قورئانیشم پێ دراوە}.

١٧- خۆپاراستن لە لادان و گومڕابوون بە هۆی دەست گرتن بە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، ئەمەش حوکمێکی بەردەوامە هەتا ڕۆژی دوایی، نابێ جیاوازی بکرێ لە نێوان کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

١٨- شوێنکەوتنی سوننەت، لەسەر هەموو نەوەیەك پێویستە لە عەقیدەو لە ئەحکامەکانی شەریعەتدا.

## دەربارەی: دونیا وەك خۆی بینین

١٠- {أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَكَادُ يَقُومُ مِنْ مَجْلِسِهِ إِلَّا دَعَا بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ: «اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ رَحْمَتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا، وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلَا تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلَا تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا وَلَا مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلَا تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لَا يَرْحَمُنَا»}[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەجلیسێك هەڵنەدەستا هەتا نەپاڕابایەوە بەم پاڕانەوانە: خوایە ترس و بیمی خۆت بخە نێو دڵمان (بەڕاددەیەك) كە دەبێتە بەربەست لە نێوانی ئێمەو گوناهو سەرپێچی كردنمان بۆت، وە ئەوەندە گوێڕایەڵی خۆتمان پێ ببەخشە كە پێی دەگەینە ڕەحمەت و بەزەیت، وە ئەو یەقین و دڵنیاییەمان پێ ببەخشە كە بە هۆیەوە ناخۆشیەكانی دونیامان لەسەر سووك ببێ، وە تام و چێژی بیستن و بینین و هێزی لەشمان بە درێژایی ژیانمان پێ ببەخشە و ، بۆمان بهێڵەوەو جێنشینیمان پێ بدە، وە تۆڵەسەندنەوەمان پێ ببەخشە لەوانەی كە ستەمیان لێكردووین، وە سەرمان بخە بەسەر ئەوانەی كە دژایەتیان كردووین، وە هەرگیز بەڵاو سەغڵەتی نەخەیە نێو ئاینمانەوە (تووشی كەمتەرخەم بوون نەبین لە جێبەجێكردنی عیبادەتەكانماندا)، وە دنیا مەكە بە گەورەترین ئامانجمان، وە ئەوپەڕی زانیارییمان كە لە دونیا بەولاتر نەچێ و بیكەینە جێی هەموو ئامانجێكمان، وە كەسانێكمان بەسەردا زاڵ نەكەیت كە سۆزو بەزەیی نانوێنن بەرانبەرمان.

---

(١) أخرجه الترمذيّ: ٣٥٠٢، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالحَاكِمُ: ١٩٣٤، قَالَ: صَحِيح عَلَىَ شَرْطِ البُخَارِي.

١١- {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا طَلَعَتْ شَمْسٌ قَطُّ إِلَّا بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ، يُسْمِعَانِ مَنْ عَلَى الْأَرْضِ غَيْرَ الثَّقَلَيْنِ: أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمُّوا إِلَى رَبِّكُمْ مَا قَلَّ وَكَفَى خَيْرٌ مِمَّا كَثُرَ وَأَلْهَى، وَلَا غَرَبَتْ إِلَّا بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقاً خَلَفاً وَأَعْطِ مُمْسِكاً تَلَفاً»}[١].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (هیچ ڕۆژێك) خۆر هەڵنایەت مەگەر لەهەر دوولایەوە دوو مەلائیکە بانگ دەکەن، ئەوەی لەسەر زەوی بێ گوێبیستی ئەو بانگە دەبێ جگە لە مرۆڤ و جنۆکە، (دەڵێن): ئەی خەڵکینە! وەرن بۆ لای پەروەردگارتان، دڵنیابن هەر شتێك کەم بێ و بەش بکات، باشترە لەوەی زۆر بێت و بێ ئاگاتان بکات، وە خۆر ئاوا نابێ مەگەر لەهەر دوولایەوە دوو مەلائیکە بانگ دەکەن و دەڵێن: خوایە! ببەخشە بەوەی کە لە پێناو تۆ دەبەخشێ و جێگای ئەوەشی بۆ پڕ بکەوە کە بەخشیویەتی، وە ئەوەشی کە نابەخشێ ماڵەکەی لێ بگرەوەو لێی بفەوتێنە.**

١٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاحُ أَوَّلِ هَذِهِ الأُمَّةِ بِالزُّهْدِ وَالْيَقِينِ، وَهَلَاكُ آخِرُهَا بِالْبُخْلِ وَالْأَمَلِ»}[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باش بوونی سەرەتای ئەم ئۆممەتە بە دونیا بە کەمگرتن و دڵنیایی و یەقینە، کۆتاییەکەشی بە ڕەزیلی و ئاوات و خۆزگە خواستنی زۆر بە هیلاك دەچێ.**

١٣- {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا أَنَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللَّهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ، فَقَالَ

---

**(١) أخرجه أحمد: ٢١٧٦٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.**

**(٢) أخرجه الطَّبَرَانِي في «الأوسط»: ٧٦٥٠، انظر: صَحِيح الجَامِع: ٣٨٤٥ ، الصَّحِيحَة: ٣٤٢٧.**

رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ، يُحِبَّكَ النَّاسُ»}[١].

**واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ڕێنماییم بکە بە کارێك ئەگەر کردم خوا خۆشی بوێم و، خەڵکیش خۆشی بوێم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دونیا بە کەم بگرە، خوا خۆشی دەوێی، بێ نیازبە لەوەی لای خەڵکە، خەڵکیش خۆشیان دەوێی.**

**١٤-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ خُطْبَةً مَا سَمِعْتُ مِثْلَهَا قَطُّ، وَقَالَ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»، فَغَطَّى أَصْحَابُهُ وُجُوهَهُمْ لَهُمْ حَنِينٌ}[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك وتارێکیدا، هەرگیز گوێم لە وتاری وا نەبووە، (دیارە ئەنەس زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەری وتارەکە) پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو وتارەکەیدا فەرمووی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن، کەم پێدەکەنن و زۆر دەگریەن، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووخساری خۆیان داپۆشی شتێکیان بەسەر سەری خۆیان داداو سەریان نزم کردەوە، دەگریان و هەنسکیان دەهات.**

**١٥-** {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ :«لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِراً مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ»}[٣].

**واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دونیا بە ئەندازەی باڵی مێشولەیەك (نرخی) هەبووایە لە لای خوا، ئەوە یەك فڕە ئاوی بە کافرێك نەدەدا.**

---

(١) أخرجه ابْنُ مَاجَهْ: ٤١٠٢، انظر: «الصحيحة»: ٩٤٤.

(٢) أخرجه البُخَارِي: ٤٦٢١، وابن حبان: ١١٣، انظر: والصَّحِيحَة: ٣١٩٤.

(٣) أخرجه أحمد: التِّرْمِذِيّ: ٢٣٢٠، انظر: «الصحيحة»: ٦٨٦.

١٦- {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَالْبَسُوا، وَتَصَدَّقُوا، فِي غَيْرِ إِسْرَافٍ وَلَا مَخِيلَةٍ، إِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ أَنْ تُرَى نِعْمَتُهُ عَلَى عَبْدِهِ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوەو ببەخشن و (جل و بەرگی جوان) بپۆشن، بێ ئەوەی کەشخەو فیزو زێدەڕۆیی تێدا بکەن، چونکە بێگومان خوای پەروەردگار حەز دەکات و پێی خۆشە نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکەیەوە ببینرێ.**

١٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَعْذَرَ اللَّهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ، حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً»}[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا بیانووی بۆ ئەو کەسە نەهێشتۆتەوە کە مردنی دواخستوە تا گەیشتۆتە شەست ساڵی.**

١٨- {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «خَيْرُ دِينِكُمُ الْوَرَعُ»}[3].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین (جۆر لە) دینداریی خۆ گرتنەوەیە (لە شتە گوماناوییەکان).**

**تێبینی: دیارە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوە هەر کەس بکەوێتە نێو شتێکی گوماناوی، ئەوە بە دڵنیایی کەوتۆتە نێو حەڕامەوە[4]، بۆیە باشترین**

---

(١) أخرجه أَحْمَد: ٦٨٠٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

(٢) أخرجه البُخَارِي: ٦٠٥٦.

(٣) أخرجه الحَاكِم: ٣١٤، ووافقه الذهبي، انظر «صحيح الجامع»: ٤٢١٤.

(٤) أخرجه البُخَارِي فِي: ٢ كتاب الإيمان: ٣٩ باب فضل من استبرأ لدينه، من حديث النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ يَقُولُ: الْحَلاَلُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُماَ مُشَبَّهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ؛ فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ..

جۆر لە هەڵسوکەوت و مامەڵە کردن لەگەڵ شتەکانی دەوروبەرە ئەوەیە هەرچی گومانی تێدابێ خۆمانی لێ بە دوور بگرین..

یەکێك لە پێشەوایان و زانایانی مەدینە دوای ئەوەی دەبیستێ کە ئاژەڵێك دزراوەو نەدۆزراوەتەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی دەپارێزێ لە خواردنی گۆشتی ئەم جۆرە ئاژەڵە، نەوەك ئەوەی کە دەیخوات گۆشتی ئەم ئاژەڵە بێت، ڕاستە ئەم نموونەو وێنەیەکی زۆر میسالیشە، بەڵام بۆ بەرچاو ڕوونی و ڕوون کردنەوەی فەرموودەکە بە زەرورم زانی باسی بکەم.

**١٩-** {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وتَشِبُّ فِيهِ اثْنَتَانِ: الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ، وَالْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ»}[1].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نەوەی ئادەم (مرۆڤ) پیر دەبێ و دوو شت بەهێزترو گەنجتر دەبنەوە لەگەڵیدا: سوور بوون لەسەر ماڵ و سامان، ئاواتخواستن لەسەر تەمەن درێژیی و ژیان.**

**٢٠-** {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ، تَغْدُو خِمَاصاً وَتَرُوحُ بِطَاناً»}[2].

**واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئێوە بە ڕاستی پشت بە خوا ببەستن، خوا ڕزقتان دەدات وەك چۆن ڕزقی باڵندە دەدات، بەیانیان بە سکی برسییەوە دەڕوات و ئێواران بە سکی تێر دەگەڕێتەوە!**

**تێبینی:[3] پێویستە لەسەرمان هەڵوەستە بکەین و ورد بینەوە لە کاتی خوێندن و بیستنی ئەم جۆرە فەرمایشتانە، چونکە ئایا لێرەدا پێغەمبەر**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٤٥٩ .

(٢) أخرجه أَحْمَد: ٢٠٥، والترمذي: ٢٣٤٤، وابن ماجه: ٤١٦٤، انظر: الصَّحِيحَة: ٣١٠.

(٣) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، سوورەتی (المائدة) ئایەتەکانی: (٨ تا ١١).

ﷺ باسی کردوە خوا چۆن ڕزق و ڕۆزی باڵندە دەدات؟ فەرموویەتی: ئەگەر لە نێو هێلانەکەیدا نەجووڵێ، ئەوە خوا هەر ڕزقی بۆ دەنێرێ؟ نەخێر، بە بەڵگەی ئەوە کە لە فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: (تَغْدُو خِمَاصَاً)، جا وشەی: (خِمَاصَاً) واتە: سکی بە پشتییەوە نووساوە، بە سکی بەتاڵەوە بەیانیان دەڕوات.

کەواتە: ئەو باڵندە لە هێلانەکەی دەردەچێ، ئنجا دەفەرموێ: (تَرُوحُ بِطَانَاً) واتە: ئێوارە بە سکی تێر دێتەوە، مانای وایە ئەو باڵندەیە جووڵەی کردوەو ئیشی خۆی کردوە، ئەگەر لە هێلانەکەیدا دەرنەچووباو ڕاوو کاری نەکردبایە، خوا لە ئاسمانەوە ڕزق و ڕۆزی نابارێنێتە نێو هێلانەکەی.

جا با بێینە سەر مەبەستی فەرموودەکە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کەواتە ئێوەش ئەگەر وەك باڵندە پشت بە خوا ببەستن، ڕۆزیتان دەدات، بەڵام پشت بە خوا بەستن وەك هی باڵندە، کە باڵندە بەیانی دەردەچێ تا ئێوارێ ڕاووشکارێ دەکات، ئنجا ئێوارێ بە تێری دێتەوە، بەڵام تۆ لە ماڵێ دابنیشی و بڵێی: وەك باڵندە پشتم بە خوا بەستوە، نەخێر تۆ وەك باڵندەت نەکردوە، چونکە باڵندە دەڕوات هەوڵدەدات، بەڵام تۆ هیچت نەکردوە، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە هەندێك لە خەڵکی بە هەڵە ئەم فەرمایشتە مانا دەکەن و بە هەڵە تێی دەگەن، دەڵێن: تەماشا بکەن! پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر بە ڕاستی پشت بە خوا ببەستن، وەك چۆن خوا ڕزقی باڵندە دەدات، ئاوا ڕزقی ئێوەش دەدات، کە ئەوە ڕاستە، بەڵام تەماشا هەموو فەرموودەکە بکە!!

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: (تَغْدُو خِمَاصَاً)، بەیانیان بە سکی بەتاڵەوە دەڕوات، (وَتَرُوحُ بِطَانَاً) ئێوارەش بە سکی تێر دەگەڕێتەوە، جا باڵندە بۆچی بەیانیان دەچێتە دەرێ؟ بۆ ئەوەی لە شوێنێك ڕزقێك پەیدا بکات، کە خوا بۆی داناوەو بە تێریی بگەڕێتەوە، بەڵام بەیانی لە نێو هێلانەکەی

دابنیشێ، بێگومان بەیانیش هەر برسی دەبێ و ئێوارەش هەر برسی دەبێ.

بەڕێزان! بۆیە دەبێ زۆر ئاگامان لە چەمك و واتای وشەی (تَوَكّل) بێ، وە ئاگامان لە چەمك و واتای وشەی (قَدَر) بێ.

٢١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دونیا بەندیخانەی ئیماندارەو، بەهەشتی بێبڕوایە.

تێبینی: ئیماندار بە هۆی دەرنەچوونی لە سنووری شەریعەت، وەك لە بەندیخانەیەك بێ وایە، لەو ڕووەوە كە بە دوای ئارەزووەكانی ناكەوێ، وە مافی خەڵك پێشێل ناكات، وە نەفسی چی پێ خۆش بوو وا ناكات، بەڵام ئینسانی كافر وەك لە بەهەشت دابێ هەموو شتێك ئەنجام دەدات و سڵ ناكاتەوە، هەروەك چۆن لە بەهەشتدا هیچ شتێك لە ئینسان قەدەغە نیە، وەك دونیا نیە، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ كە خۆشی دونیا بە بەراورد لەگەڵ خۆشی بەهەشت هێندە كەم و ناخۆشە بە نسبەت كەسی بڕوادار، وەك بەندیخانە وایە، وە ناخۆشی دونیا بە بەراورد لەگەڵ ناخۆشی دۆزەخ هێندە كەم و كورتە وەك بەهەشت وایە بە نسبەت كەسی كافر.

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٧٦٠٦.

## دەربارەی: صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ[١]

### أ- لە ئەسڵی زمان دا:

(الصَّـــلاَةُ): لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە مانای پاڕانەوەو بە پێز کردن و بە بەرزگرتن دێ، (يُقَالُ: صَلَّيتُ عَلَيهِ أي: دَعوتُ لَهُ وَزَكَّيتَهُ) دەگوترێ: صەڵاواتم لەسەردا، واتە: بۆی پاڕامەوە، وە بە پاك و چاكم دانا، وەك خوای تعالى لە قورئاندا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾التوبة، واتە: دوعای داباریني ڕەحمەت بکە بۆیان (واتە: بۆ ئیمانداران) ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بکە، چونکە بێگومان دوعاو نوێژی تۆ مایەی ئارامیە بۆیان.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: (إذَا دُعِيَ أحَدُكُمْ إلى طَعَام فَلْيُجِبْ، فَإنْ كَانَ مُفْطِراً فَلْيَأكُل، وإنْ كَانَ صَائِماً فَلْيُصَلِّ)[٢]، واتە: ئەگەر یەکێکتان بۆ خواردنێك بانگهێشت کرا، با وەڵام بداتەوە، وە ئەگەر بەڕۆژووش بوو، با دوعا بۆ دەعوەتکەر بکات (واتە: بپاڕێتەوە بڵێ: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە).

### ب- لە زاراوی شەرعدا:

(الصَّلاَةُ): بریتیە لەو عیبادەتەی کە هەموو ئەو گوفتارو کردارە تایبەتیانە دەگرێتەوە کە بە تەکبیر کردن دەست پێ دەکاو بە سەلام دانەوە کۆتایی دێ، کە ئەویش پێی دەگوترێ: نوێژ، دیارە مەبەستیش لە گوفتارو قسەکان

---

(١) پاداشتی کارە چاکەکان: لاپەڕە: ١٦٦.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٣٥٩١ .

بریتیە لە: تەکبیر کردن و خوێندنی قورئان و بە پاکگرتنی خواو وێنەی ئەوانە، وە مەبەستیش لە کردارەکان بریتیە لە: ڕاوەستان و چەمینەوەو کڕنووش بردن و دانیشتن و وێنەی ئەوانە.

## ماناى صەڵاوات لەلایەن

صەڵاوات ناردن لە لایەن هەر یەکێك لە: خوای بێ وێنەو، فریشتە بەڕێزەکان و، مسوڵمانانەوە سێ مانای جیاوازی هەن، کە ئێمە بە کورتی باسی دەکەین بۆ ئەوەی هەر کاتێك گوێمان لێ بوو کە باسی صەڵاوات دان لەلایەن هەر یەکێکیانەوە کرا، وەك خۆی تێی بگەین:

یەکەم: بە نسبەت خوای بێ وێنە کە صەڵاوات دەنێرێ بۆ پێغەمبەری خۆی، وە بۆ مسوڵمانان، خاوەنی کتێبی (مفردات ألفاظ القرآن)[1] گوتوویەتی: (وَصَلَاةُ اللّٰهِ لِلمُسلِمِينَ هُوَ فِي التَّحقِيق: تَزكِيَته إِيَّاهُمْ)، صەڵاواتی خوا بۆ مسوڵمانان بریتیە لەوە کە خوا پاك و، چاکیان بکات و، پلەیان بەرزبکاتەوەو گەشەیان پێ بدات.

دووەم: (ومِنَ المَلَائِكَةِ هِيَ الدُّعَاء وَالإِستِغفَار كَمَا هِيَ مِنَ النَّاس) وە صەڵاواتی فریشتەکانیش بریتیە لە پاڕانەوەیان، وە داوای لێبوردن و لێخۆشبوون کردنیان بۆ مسوڵمانان لە خوا سبحانە وتعالى، هەروەك خەڵك ئاوا دوعاو پاڕانەوە بۆ یەکدی دەکەن لە لای خوا.

سێیەم: هەروەها خەڵکیش کە صەڵاوات دەنێرن بۆ پێغەمبەر ﷺ، واتە: بۆی دەپاڕێنەوە کە خوا پلەو پایەو مەنزڵگای بەرزتر بکاتەوە هەم لە دونیا، هەم لە دواڕۆژ.

---

(١) لأبو القاسم الحسين بن محمّد المعروف بالراغب الأصفهاني، ص٢٨٥.

## چۆنیەتی صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ



«اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[١].

خوایە! درودو ڕەحمەت بڕێژە بۆ سەر موحەممەد، وە خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، هەر وەك چۆن درودو ڕەحمەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، بێگومان تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت، خوایە! پێزو بەرەکەت بڕێژە سەر موحەممەد، وە خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، هەروەك چۆن پێزو بەرەکەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، بە ڕاستی تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت.

٢٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَتَّخِذُوا قَبْرِي عِيداً، وَلَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً، وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ تَبْلُغُنِي»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەبری من مەکەن بە شوێنی پەرستش و پاڕاناوە، وە ماڵەکانیشتان مەکەن بە قەبرستان (بەوەی هیچ نوێژێکی سوننەتی تێدا نەکەن)، وە لە هەر شوێنێك بوون صەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان صەڵاواتەکانتانم پێدەگات.

٢٣- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ، يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلَامَ»}[٣].

---

(١) أخرجه البُخَاريُّ: ٥٩٩٦، وَمُسْلِم: ٩٣٥.

(٢) أخرجه أبو داود ٢٠٤٢، قال الألباني: صحيح.

(٣) أخرجه أحْمَد: ٣٦٦٦، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الصحيح.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خوا لەسەر زەوی فریشتەی گەڕۆك و گەشتیاری هەن، سەلامی ئۆممەتەکەمم پێ دەگەیەنن.**

٢٤- {عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الْبَخِيلَ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ»}(١).

**واتە: عەلی کوڕی حوسەین دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ کە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی ڕەزیل و چرووك کەسێکە: ناوی منی لەلا دەهێنرێ و صەڵاواتم لەسەر نادات.**

٢٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْراً»}(٢).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات، خوای بەرز دە قات ڕەحمی پێ دەکات و پاداشتی دەداتەوە.**

٢٦- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَجْلِسُ قَوْمٌ مَجْلِساً، لَا يُصَلُّونَ فِيهِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِلَّا كَانَ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً، وَإِنْ دَخَلُوا الْجَنَّةَ لِمَا يَرَوْنَ مِنَ الثَّوَابِ»}(٣).

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کۆمەڵێك دابنیشن و صەڵاوات نەدەن لەسەر پێغەمبەری خوا، بێگومان ئەم کۆڕە دەبێتە مایەی پەشێمانیان، هەرچەند بچنە بەهەشتیش، چونکە**

---

(١) أخرجه البَيْهَقِيّ في «شعب الإيمان»: ١٥٦٨، وَصَحَّحَهُ الألباني في «فضل الصلاة على النبي ﷺ» رقم: ٣٥.
(٢) أخرجه مُسْلِمٌ: ٤٠٨.
(٣) أخرجه النَّسَائِيّ في «الكُبْرَى»: ١٠٢٤٢، انظر «صحيح الجامع»: ٧٦٢٤.

**لە بەهەشت پاداشتی صەڵاوات دەبینن (کە چەند زۆرە، خۆزگە دەخوازن لە گشت مەجلیسەکانیان بە صەڵاوات دەستیان پێکردبایە!).**

**٢٧-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ، إِلَّا رَدَّ اللَّهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك (لە مسوڵمانان) سەلامم لێبکات، ئەوە خوا ڕووحم بۆ دەگێڕێتەوە هەتا وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە.**

**٢٨-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرَ صَلَوَاتٍ، وَحَطَّ عَنْهُ عَشْرَ خَطِيئَاتٍ»}[2].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك (لە مسوڵمانان) یەك صەڵاواتم لەسەر بدات، خوا دە جار پاداشتی دەداتەوەو ڕەحمی پێ دەکات، دە گوناهیشی لێ دەسڕێتەوە.**

---

(١) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٢٠٤٣، انظر: «الصحيحة»: ٢٢٦٦.

(٢) أخرجه النَّسَائِيُّ: ١٢٩٧، انظر: «مشكاة المصابيح»: ٩٢٢.

## سوودەكانی صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

١- فەرمانی خوای بەرزت بە جێهێناوە.

٢- دوعات بۆ بەرزتر بوونەوەی پلەو پایەی پێغەمبەر كردوە كە (الوسيلة)یە.

٣- بە هەر صەڵاوات ناردنێكت، دە جار ڕەحمت پێ دەكرێت لەلایەن پەروەردگار.

٤)- دە پلە بەرز دەبیتەوە.

٥- دە چاكەت بۆ دەنووسرێ.

٦- دە گوناهو خراپەت لێ دەسڕدرێتەوە.

٧- دوعات قبووڵ دەبێ ئەگەر بە صەڵاوات ناردن دەستت پێكردبێ.

٨- شەفاعەتت بۆ دەكرێ لە ڕۆژی قیامەت.

٩)- لە پێغەمبەر ﷺ نزیك دەبیەوە لە ڕۆژی دوایی.

١٠- خۆشەویستی و گوێڕایەڵیت بۆ پێغەمبەر ﷺ بەردەوام زیاد دەكات.

١١- پێغەمبەر ﷺ سەلامت بۆ دەنێرێتەوە.

١٢- بەرەكەت دەكەوێتە تەمەن و ئیش و كارت.

١٣- بەردەوام خوا باست دەكات لە نێو فریشتەكان.

١٤- ڕێگەی چوونە بەهەشتت بۆ خۆش دەبێ.

١٥- نوورێكی تایبەتت دەبێ لەسەر پردی صراط.

١٦- دڵ تووندی و خەم و پەژارەت نامێنێ.

## دەربارەی: ڕووپامایی (الرياء)

**٢٩-** {عَنْ جُنْدُبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ يُرَائِي يُرَائِي اللَّهُ بِهِ»}[1].

**واتە: جوندوب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بە دوای ناوبانگ بگەڕێ، خوا ناوی دەزڕێنێ و دەیکاتە جێگەی قسەو باسی خەڵکی، وە هەر کەسیش ڕووپامایی و ڕیا بکات، خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا بۆ خەڵکی ڕونی دەکاتەوە ئەو بەندەیەی کردەوە باشەکانی بۆ خوا نەبووە، بەڵکو بۆ خەڵکی و ناوبانگ و بە چاك زانین کردویەتی.**

وەڵامی پرسیارێك: **ئایا ئەگەر گوێ بیست بووین لەلایەن خەڵکەوە مەدح دەکراین لەسەر کردەوە باشەکانمان، جێی دڵخۆشیە، یان دەبێ بترسین لەوەی کە ئێمە تووشی ڕیاو ڕووپامایی بووبین؟**

**بێگومان ئەوە جێی دڵخۆشیە، بۆ ئەو کەسەی مەدح دەکرێ، بە مەرجێك مەبەستی لە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان ئەوە نەبووبێ کە مەدح بکرێ، چونکە بە کردەوەو ڕەفتارو ڕەوشتی جوان توانیویەتی سەرنجی خەڵك ڕابکێشێ و گوفتارەکانی کردوون بە کردار، ئەوەش فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویستی ﷺ لەسەرە:** «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يَعْمَلُ الْعَمَلَ مِنَ الخَيْرِ، وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ، قَالَ: تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ»[2].

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٦١٣٤.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٢٦٤٢.

واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی (جاری وایە) پیاوێك كارێكی چاك دەكات، خەڵكیش مەدحی دەكەن (لەسەر ئەو كارە چاكە، ئایا ئەوە ڕیایە؟) فەرمووی: ئەوە موژدەیەكی بە پەلەیە (لە دونیا پێش قیامەت) بۆ بڕوادار.

جا لە شەرحی ئەو فەرموودە: «تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ» هەر یەك لە ئیبنو عەبباس و قەتادەو زوهری و كۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن: ئەو موژدەیە بریتیە لە موژدەدانی فریشتەكان لە كاتی هاتنە خوارەوەیان لەلایەن خوای بەرزەوە لە كاتی مردنی ئەو كەسانەو پێیان دەڵێن: ﴿...أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ۝٣٠﴾ فصلت.

پێشەوا نەوەوی[1] دەڵێ: لە ڕیوایەتی دیكە هاتوە: (ويحبّه النَّاس عَلَيْهِ) واتە: خەڵك خۆشیان دەوێ بە هۆی ئەو كردەوە چاكەوە كە كردوویەتی، زانایان دەڵێن: مەبەست لێرەدا موژدەی بە پەلەی خێرو چاكەیە، كە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕەزامەندی خوای تعالی بۆی مسۆگەر بووەو خۆشەویستیشی كردوە لە لای خەڵك، هەروەك لە حەدیسی ڕابردو باسكراوەو پاشان دەفەرموێ: (يوضَعُ لَهُ القبولُ فِي الأَرْض)، بە مەرجێك مەبەستی لەو كارەدا ئەوە نەبووبێ خەڵك مەدحی بكەن لەسەری (ئەوەش هەر خوا دەزانێ، بەندە ناتوانێ ئەوە بزانێ جگە لە كەسەكە، بۆیە وا باشە قسە لەسەر نیەتی هیچ كەسێك نەكرێ).

٣٠- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً غَزَا يَلْتَمِسُ الْأَجْرَ وَالذِّكْرَ، مَالَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا شَيْءَ لَهُ» فَأَعَادَهَا ثَلَاثَ مَرَاتٍ، يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا شَيْءَ لَهُ» ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلَّا مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ»}[2].

---

(١) المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، الناشر: دار إحياء التراث العربي، بيروت، الطبعة الثانية، ج١٦، ص١٨٩.

(٢) أخرجه النَّسَائِي: ٣١٤٠، انظر: «صحيح وضعيف سنن النسائي»: ٣١٤٠.

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: دەبینی پیاوێك جەنگ و جیهاد دەكات دەیەوێ پاداشتی دەستكەوێ، لە هەمان كاتدا (خەڵكیش) مەدحی بكەن، ئایا (ئەو كەسە) چی بۆ هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ پاداشتی نیە، سێ جار (پرسیارەكەی) دووبارە كردەوە، پێغەمبەریش ﷺ هەر پێی دەفەرموو: هیچ پاداشتی نیە، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بێگومان (لە ڕۆژی دوایی) خوا هیچ كردەوەیەكی باش وەرناگرێ ئەگەر بە پاكی و بە مەبەستی ڕەزامەندی ئەو ئەنجام نەدرابێ.

٣١- {عنْ أَبِي سعْدِ بنِ أَبِي فضالةَ الأَنْصاريَّ ﷺ قال: قال رسولُ اللهِ ﷺ: «إِذَا جَمَعَ اللَّهُ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ، نَادَى مُنَادٍ: مَنْ كَانَ أَشْرَكَ أَحَداً فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ للهِ، فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللهِ، فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنْ الشِّرْكِ»}[1].

واتە: ئەبو سەعیدی كوڕی ئەبو فەزالەی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێك خوا هەموو ئەوانەی سەرەتاو كۆتایی كۆدەكاتەوە لە ڕۆژێكدا كە هیچ گومانی تێدانیە، بانگ بێژێك بانگ دەكات: هەر كەسێك هاوبەشێكی لە كردەوەیەكی داناوە كە بۆ خوای ئەنجام داوە، با پاداشتەكەی لە غەیری خوا داوا بكات، وە بێگومان من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندو بێنیازەكانم لە هاوبەش بۆ دانان.

٣٢- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الشِّرْكُ الخَفِيُّ: أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ لِمَكَانِ الرَّجُلِ»}[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوبەش دانانی پەنهان و شاراوە: بریتیە لەوە كەسێك كردەوەیەك بكات بۆ ئەوەی لە لایەن كەسی دیكەوە ببینرێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٩١٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

(٢) أخرجه الحَاكِم: ٧٩٣٦، انظر «صحيح الجامع»: ٣٧٢٩.

٣٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «إِنَّ اللّٰهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَادِكُمْ، وَلَا إِلَى صُوَرِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ» وَأَشَارَ بِأَصَابِعِهِ إِلَى صَدْرِهِ}[١].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا تەماشای جەستەو شێوەتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەکانتان دەکات، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) بە پەنجەکانی ئاماژەی بۆ دڵی کرد.**

٣٤- {عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «بَشِّرْ هَذِهِ الْأُمَّةَ بِالسَّنَاءِ، وَالرِّفْعَةِ، وَالنَّصْرِ، وَالتَّمْكِينِ فِي الْأَرْضِ، فَمنْ عَمِلَ مِنْهُم عمَلَ الْآخِرَةِ لِلدُّنْيَا، لَمْ يَكُنْ لَهُ فِي الْآخِرَةِ نَصِيبٌ»}[٢].

**واته: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: موژدە بدە بەم ئوممەتە بە: پایە بەرزی و، دینداریی و، سەربەرزی و، سەرکەوتن و، جێگیر بوون و بوونە خاوەن دەسەڵات لەسەر زەوی، جا هەر کەسێك کردەوەی دواڕۆژی لە پێناو دنیادا ئەنجامدا ئەوە لە دواڕۆژ بێبەش دەبێت.**

## دەربارەی: دووڕوویی (النفاق)

٣٥- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «خَصْلَتَانِ لا تَجْتَمِعَانِ فِي مُنَافِقٍ: حُسْنُ سَمْتٍ، وَلاَ فِقْهٌ فِي الدِّينِ»}[٣].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو سیفەت هەن لە کەسی دوو ڕوو کۆنابنەوە (ئەوانیش): جوانی شێوەو ڕواڵەتی دینداری، وە تێگەیشتن و شارەزایی لە ئایین.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٦٧٠٧.

(٢) أخرجه أَحْمَد: ٢١٢٥٨، انظر: «صحيح الرغيب والترهيب»: ٢٣.

(٣) أخرجه التِّرْمِذِيّ: ٢٦٨٤، انظر: «الصحيحة»: ٢٧٨.

٣٦- {عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلْمُنَافِقِ يَا سَيِّدُ فَقَدْ أَغْضَبَ رَبَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى»[١].

**واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك بە کەسێکی دووڕووی گوت: ئەی گەورەم! ئەوە خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى)ی لە خۆی تووڕە کردوە.**

**تێبینی: هەر کەس بە ئەندازەی خۆی ڕێزی لێ دەگیرێ، نابێ زیاد لەوەی هەیە بە گەورە بگیرێ، بەڵام حاڵەتی مونافق و دوو ڕوو تایبەتترە، نابێ بە هیچ جۆرێك زیاد لە پێویست ڕێزی لێ بگیرێ، لەبەر ئەوەی مونافیقان دۆستی کافران و دوژمنی مسوڵمانانن، وە لە ناوبەری ڕەوشتە بەرزەکان و هێنەرەی ڕەوشتە پەستەکانن، وە یەکێك لەو شتانەی کە زۆر دڵیان پێ توووند دەبێ بریتیە لە زەم کردنیان، وە ئەوەی کە دڵیان زۆر پێی خۆش دەبێت بریتیە لە مەدح کردنیان، نابێ مەدح بکرێن، تا دڵخۆش نەکرێن، هیچ شتێك لە ئینسان هێندە ناشرین نیە، وەك ئەوەی کە خاوەنی دوو ڕوویی بێت، کە ئا ئەوانە وان.**

٣٧- {عَنْ عِمْرَان بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ بَعْدِي كُلُّ مُنَافِقٍ عَلِيمِ اللِّسَانِ»}[٢].

**واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی ئەوەی من زۆر ترسم لێی هەیە دوای خۆم، بریتیە لە هەموو مونافقێکی زارو زمان لووس (کە زیان بە مسوڵمانان بگەیەنێت و بە زمان لوسیەکەی فریویان بدات).**

---

**(١) أخرجه الحَاكِم: ٧٨٦٥، انظر: «صحيح الجامع»: ٧١١.**

**(٢) أخرجه الطَّبَرَانِي في «الكبير»: ٥٩٣، انظر: «صحيح الجامع» رقم: ١٥٥٦.**

٣٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ، ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ، وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ»}(١).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خراپترین کەس، کەسی دوو ڕووە (واتە قسە گێڕەرەوەو خراپەکار): دەچێ بۆ لای ئەملا بە ڕوویێك و، بەرەو ئەولاش بە ڕوویێکی دیکە.**

٣٩- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ»، فَلَمَّا دَخَلَ انْبَسَطَ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ؟ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ»}(٢)

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك داوای هاتنە ژوورەوەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش بەر لەوەی کابرا بێتە ژوور فەرمووی: خراپترین کەسی نێو هۆزەکەیەتی، کە هاتە ژوورەوە (پێغەمبەر ﷺ) ڕووی خۆی بۆ کردەوە (بە گەشاوەیی پێشوازی لێ کرد)، منیش گوتم: (بۆچی ئاوات فەرموو و ئاواش ڕەفتارت لەگەڵ کرد)؟ فەرمووی: بێگومان خوا قسەی نابەجێ و کردەوەی نابەجێی خۆشناوێن.**

**(وەك لە فەرموودەی دیکەدا هاتوە بۆیە خۆی لێ پاراستووە تاوەکو لە دەرەوە قسەی نەشیاوو بێ ڕێزی نەکات و لە خراپەی پارێزراو بێ).**

**تێبینی: خاوەنی (عمدة القاري شرح صحيح البخاري)(٣)، دەڵێ: باس کردنی کەسێك بەم شێوەیە کە لەو کاتەدا لەوێ نەبووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە بە خراپ باسی کەسی خراپەکارو ئاژەوگێڕو زمان شڕ بکرێ، وە بە هیچ جۆرێك بە غەیبەت هەژمار ناکرێ، مادام مەبەستت ئەوە بێت**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٥٢٦.

(٢) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٧٥٥، وأخرجه أيضا البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- باب: لم يكنى ﷺ فَاحِشاً وَلَا مُتَفَحِّشاً. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح٧٣)

(٣) ج٣٢، ص٢٣٥.

**نەصیحەت و ئامۆژگاری ئەو کەسانە بکەی کە لەوێن و ئاگاداریان بکەیەوە لەو کەسە خراپەکارە بۆ ئەوەی لە زیانی بە دوور بن، ڕاستە شێوەی غەیبەتی تێدایە، بەڵام لە ڕووی شەرعەوە بە غەیبەت هەژمار ناکرێ، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانی دەوروبەری خۆی ئاگادار کردەوە لە خراپی ئەو کابرایە.**

**٤٠-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إذا اؤْتُمِنَ خانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چوار سیفەت لە هەر کەسێکدا هەبن، ئەوە موونافیقێکی تەواوە، وە هەر کەسێك یەك لەو چوار سیفەتەی تێدا هەبن، ئەوە سیفەتێك لە سیفەتەکانی نیفاقی تێدان، تاکو دەستی لێ هەڵدەگرێ (کە بریتین لەمانە): هەر کاتێ بە ئەمیندار دانرا خیانەت بکات، وە هەمیشە لە کاتی قسەکردن درۆ بکات، وە هەردەم لە کاتی پەیمان دان غەدر بکات و پەیمان بشکێنێ، وە هەر کاتێ دەمەقاڵێ و مشت و مڕی بوو، خۆی تووشی گوناهو تاوان بکات.**

**اللّهُـــمَّ!**

طَهِّرْ قلُوبَنا مِنَ النِّفاقِ
وأَعَمَــالنَا مِــنَ الـرِّياءِ
ولِسـانَنا مِنَ الكَــذِبِ
وأَعيُنَـنا مِنَ الـخـِـيانَةِ
**فَإِنَّكَ تَعْلَمُ خَائِنَةَ الأَعْيُنِ، وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ.**

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٣٤.

## دەربارەی: غەیبەت و حەسوودی

**٤١-** {عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَنْطَبٍ ﷺقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الغِيْبَةُ: أَنْ تَذْكُرَ الرَّجُلَ بِمَا فِيهِ مِنْ خَلْفِهِ»}[1].

**واته: موتەللیبی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حەنطەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: غەیبەت بریتیە لەوەی: لە پاشملە باسی کەسێك بکەی بە سیفەتێك کە تێیدایە. (دیارە دەبێ ئەو کەسە پێشی ناخۆشبێ).**

**٤٢-** {عَنْ أَنس ﷺ: قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكَ وكُلَّ أَمْرٍ يُعتذَرُ مِنْه»}[2].

**واته: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆت بپارێزە لە هەر کارێك کە پێویست بە داوای لێبوردن دەکات.**

**تێبینی: هەر وشەیەك کە دەمانەوێ بیڵێین بیری لێبکەینەوە، هەر هەنگاوێ دەمانەوێ بیهاوێین بیری لێبکەینەوە، تا هەڵە نەکەین و دواتر داوای لێبوردنی لەسەر نەکەین، زۆر لە خەڵك ببورین، بەڵام هەوڵبدەین زۆر کەم بە خەڵك بڵێین: بمبوورە!!**

**٤٣-** {عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ ذَبَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ فِي الْغَيْبَةِ كَانَ حَقّاً عَلَى اللَّهِ أَنْ يُعْتِقَهُ مِنَ النَّارِ»}[3].

**واته: ئەسمائی کچی زەید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك بەرپەرچی لەکەدار کردنی برای مسوڵمانی بداتەوە لە کاتێك کە کەسەکە خۆی لەوێ نیە، ئەوە هەقێکە لەسەر خوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ ئازادی بکات.**

---

**(١) أخرجه مالك: ١٧٨٦، وهناد: ١١٧٢، وابن المبارك: ٧٠٤، انظر: «صحيح الجامع»: ٤١٨٦.**

**(٢) أخرجه الضياء: ٢١٩٩، وقال: إسناده حسن، وَحَسَّنَهُ الألباني في «الصحيحة»: ١٤٢١.**

**(٣) أخرجه الطَّبرَانيُّ في «الأوسط»: ٤٤٣، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٨٤٧.**

٤٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ»، قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ بَهَتَّهُ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا دەزانن غەیبەت چیە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن و زاناترن! فەرمووی: (غەیبەت ئەوەیە کە) باسی براکەت بکەی، ئەو پێی ناخۆشبێ، گوتیان: ئەدی ئەگەر ئەوەی کە دەیڵێین تێیدا بوو؟ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێی تێیدابوو ئەوە غەیبەتت کردوە، بەڵام ئەگەر ئەوەی دەیڵێی تێیدا نەبوو، ئەوە بوختانت بۆی هەڵبەستوە.**

٤٥- {عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ :«مِنْ أَرْبَى الرِّبَا الاِسْتِطَالَةُ فِي عِرْضِ الْمُسْلِمِ بِغَيْرِ حَقٍّ»}[2].

**واتە: سەعیدی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خراپترین جۆری ڕیباو سووخۆریی، بریتیە لە: زێدەڕۆیی کردن و قسەی ناشرین گوتن و بە سووك تەماشا کردن و باس کردنی ناموسی مسوڵمان بە ناهەق.**

٤٦- {عَنْ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ ﷺ عَنْ اَلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ بِالْغَيْبِ، رَدَّ اَللَّهُ عَنْ وَجْهِهِ اَلنَّارَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ»}[3].

**واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕێگری بکات لە لەکەدار کردنی برای مسوڵمانی لە پاشملە (کاتێك بە خۆی ئامادە نیە)، ئەوە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی ئەو کەسە دەپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٥٨٩.

(٢) أخرجه أَبُو دَاوُد: ٤٨٧٨، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٥٣٢.

(٣) أخرجه التِّرْمِذِيُّ: ١٩٣١، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٨٤٨.

٤٧- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمُشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ، وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ!»}[1].

**واته: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتێك بەرز کرامەوە (لە شەوڕۆیی) بە لای کۆمەڵێکدا تێپەڕ بووم، نینۆکیان لە مس بوو، دەم و چاوو ڕووخسارو سینگی خۆیانیان پێ دادەڕنی، گوتم: ئەی جبریل ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانەن کە (لە دونیا) گۆشتی خەڵکیان دەخواردو، باسی خەڵکیان دەکردو دەکەوتنە باس کردنی نامووسی خەڵك!**

٤٨- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ، يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»}[2].

**واته: جابر ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان سەلامەت و پارێزراو بن لە زمان و دەستی.**

٤٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَفِظَ ما بَيْنَ لَحَيَيْهِ وَرِجْلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ»}[3].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ئەوەی لە نێوان هەردوو شەویلگە و ڕانی دایە (واته: زمان و عەورەتی) بپارێزێ (لە حەڕام)، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.**

---

(١) أخرجه أَبُو دَاوُد: ٤٨٨٠.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ١٧١.

(٣) أخرجه الحاكم في «المستدرك»: ٨٠٥٨ ، وقال: صحيح الإسناد تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح، «صحيح الجامع»: ١٤٠.

٥٠- [عَنْ ثَوْبَان ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طُوبَى لِمَنْ مَلَكَ لِسَانَهُ، وَوَسِعَهُ بَيْتُهُ، وَبَكَى عَلَى خَطِيئَتِهِ»][1].

**واته: ثەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشی بۆ ئەو کەسەی: زاڵ بێ بەسەر زمانی (واتە: زمانی کۆنترۆڵ بکات)، وە لە ماڵی خۆی دانیشێ (زیانی بۆ خەڵك نەبێ)و، بگرێ کاتێك بیر لە هەڵەو گوناهەکانی خۆی دەکاتەوە.**

٥١- [عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا»][2].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەسوودیی دروست نیە، تەنیا لە دوو شتان دا نەبێ: پیاوێك خوا ماڵی پێداوە، وە زاڵیش کراوە بەسەر خەرج کردنی لە ڕێی هەقدا، وە پیاوێکیش خوا زانست و حیکمەتی داوەتێ، ئەویش بەکاری دێنێ و خەڵکی لێ فێر دەکات.**

**تێبینی:[3] دەربارەی وشەی: (حَسَد) زانایانی ئیسلام دەڵێن: (تَمَنِّي زوال نعمة الخير على الغير) واتە: بە خۆزگە بخوازی نیعمەتێکی چاك لابچێت لەسەر کەسێکی، وە دەربارەی وشەی: (غِبْطَة) خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح) لە لاپەڕە (٤٧٧)، دەڵێ: (الغِبْطَةُ بالكَسْرِ أَن تَتَمَنَّى مِثْلَ حَالِ الْمَغْبُوطِ مِنْ غَيْرِ أَن تُرِيدَ زَوَالَها عَنْهُ وَلَيْسَ بِحَسَدٍ) بە کەسری پیتی (غ)، ئەوەیە کە تۆ پێت خۆشبێ تۆش وەك ئەوت هەبێ بەبێ ئەوەی بتەوێ ئەو نیعمەتە لەسەر ئەو لابچێ و نەمێنێ، کە ئەوە حەڕام نیە، لێرەدا مەبەست لە (حَسَد)، (غِبْطَة)یە.**

---

(١) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ: ٢١٢، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٨٥٥.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٧٣، ومُسلِم: ١٩٣٣.

(٣) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، سوورەتی (النساء) ئایەتی: ٥٤.

**بۆ نموونە: کەسێکە خەڵك خۆشی دەوێ، ڕێزێکی هەیە لە نێو خەڵك، تۆ پێت ناخۆشە ئەو حورمەت و ڕێزەی هەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە شایستەیەتی، ئنجا جاری وایە سەرەڕای پێ خۆشبوونی ئەوەی کە ئەو نیعمەتەی لێ لابچێ کابرا هەوڵیش دەدات، واتە: زەمی دەکات، دەیەوێ بیشکێنێ لە نێو خەڵك و بە سووکی باسی دەکات، جاری وایە بوختانیشی بۆ هەڵدەبەستێ، ئەوە حەسەدە.**

**ڕاست دەکات ئەو کەسەی گوتوویەتی:**

(كُلُّ العَدَاوةِ قدْ تُرْجَى إزالَتُهَا ... إلاَّ عداوةٌ منْ عَادَاكَ مِنْ حَسَدٍ).

**واتە: هەموو دوژمنایەتیەك دەگونجێ کۆتایی پێ بێ ... جگە لە دوژمنایەتی ئەو کەسەی کە لەبەر حەسوودی دژایەتیت دەکات، ئەوە هیچ چارەی نیە، چونکە گوتراوە:**

(لا عِلاَجَ لِلْحَسَدِ، إمَّا مَوْت الحَاسِدِ أَو الـمَحْسُودِ).

**واتە: حەسوودی هیچ چارەسەری نیە، یان ئەوەتا دەبێ کەسی حەسوود بمرێ و لە کۆڵ بێتەوە، یان دەبێ ئەو کەسەی حەسوودی پێ دەبرێ وەفات بفەرموێ.**

## دەربارەی: قیامەت و لێپرسینەوە

**٥٢-** {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللَّهِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء، ثُمَّ إِنَّ أَوَّلَ مَنْ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ»}[1].

---

**(١) أخرجه البُخَاري: ٤٤٦٣.**

**واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: دڵنیابن ئێوه بەپێی پەتی و بەڕووتی و بەخەتەنە نەکراوی کۆدەکرێنەوه بۆ بەردەم خوا، هەروەك چۆن سەرەتا یەکەم جار دروست کراون، بەمشێوەیە دەگەڕێنرێنەوە، (خوا دەفەرموێ:)** ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء، **واته: ئەوه بەڵێنێکه لەسەرمان، بێگومان ئەنجامدەری (ئەو بەڵێنەین)، پاشان یەکەمین کەس له نێو دروستکراوەکان (له ڕۆژی دوایی) که پۆشاك دەکرێ (پێغەمبەر) ئیبراهیمه (علیه السلام).**

**٥٣-** {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ»}[1].

**واته: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: له ڕۆژی دوایی خەڵك لەسەر زەویەکی سپی کۆدەکرێنەوه، وەکو نانێکی سپی وایە، گوناهی لەسەر نەکراوه، وه هیچ کەسێك هیچ نیشانەیەکی نیه که جیای بکاتەوه لەوانی دیکه.**

**٥٤-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ حُوسِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عُذِّبَ»، فَقُلْتُ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾﴾، فَقَالَ ﷺ: «لَيْسَ ذَاكِ الْحِسَابُ، إِنَّمَا ذَاكِ الْعَرْضُ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عُذِّبَ»}[2].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لێ پرسینەوەی لەگەڵ کرا له ڕۆژی دوایی ئەوه ئازار دراوه، (عائیشه دەڵێ) گوتم: ئەی خوای زاڵی پایەدار نەیفەرمووه:** ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾﴾، **واته: ئیتر پرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی**

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٦١٥٦، وَمُسْلِم: ٧٢٣٣.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٧٤٠٦.

لەگەڵدا دەکرێ، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەوە ئەم حیسابە نیە، بەڵکو ئەوە تەنیا پێشاندانی کردەوەکانیەتی، هەرکەسێك لە ڕۆژی دواییدا لەبارەی حیساب و کیتابی قسەی لەگەڵ بکرێ، ئەوە ئازار دراوە.

تێبینی: دیارە ئەمە تەنیا پێشاندانی کردەوەکان دەگرێتەوە، بەڵام ئەوەی کە دەیەوێ دیفاع و بەرگری بکات، ئەوە حاڵی زۆر خراپەو موناقەشە کردن لەم ڕۆژەدا ماڵی خاوەنەکەی وێران دەکات، چونکە دەستەکان و پێیەکان و چاوو گوێ هەموو دێنە دوان و شایەتی بە هەق دەدەن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾يس. وە خوا ﷻ دەربارەیان لە ماڵی هەمیشەیی بێبڕوایان کە دۆزەخە فەرموویەتی: ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾ (واتە: ئەمڕۆ مۆر دەدەین بەسەر دڵەکانیاندا)، بەوەی لاڵیان دەکەین، هیچ قسە ناکەن، توانایان نیە لە نکوڵی کردنی ئەوەی کردوویانە لە کوفرو بێبڕوایی، ﴿ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ واتە: ئەندامەکانی جەستەیان شایەتیان لەسەر دەدەن بەوەی کردوویانە، وە دەیانهێنێتە قسە کردن ئەو زاتەی هەموو شتێکی هێناوەتە قسە کردن.

٥٥- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ ٱلنَّاسِ يَوْمَ القِيَامَةِ فِي ٱلدِّمَاءِ»}[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شت لە ڕۆژی دوایی کە لێ پرسینەوەو دادوەریی لەسەر دەکرێ (لە مافی خەڵکی): خوێنە (واتە: وەرگرتنەوەو تۆڵەسەندنەوەی کوشتن و خوێن ڕشتنە).

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٦٥٣٣، وَمُسْلِم: ١٦٧٨، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِم.

٥٦- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ، يَا رَسُولَ اللهِ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ فَقَالَ: الأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَهِمَّهُمْ ذَاكِ»}[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵك لە ڕۆژی دوایی بە پێی پەتی و ڕووتی و خەتەنە نەکراوی دەبردرێن بۆ لێپرسینەوە، (عائیشە دەڵێ:) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! (مادام ڕووتن) پیاوان و ئافرەتان هەندێکیان سەیری هەندێکیان ناکەن؟! فەرمووی ﷺ: کارەکە زۆر لەوە سەختترە کە هەندێك تەماشای هەندێکی دیکە بکەن (کەس لەبیری ئەوەدا نیە).**

٥٧- {عَنِ الْمِقْدَادِ ﷺ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أُدْنِيَتِ الشَّمْسُ مِنَ الْعِبَادِ حَتَّى تَكُونَ قِيدَ مِيلٍ أَوْ مِيلَيْنِ، قَالَ فَتَصْهَرُهُمُ الشَّمْسُ، فَيَكُونُونَ فِي الْعَرَقِ كَقَدْرِ أَعْمَالِهِمْ، مِنْهُمْ مَنْ يَأْخُذُهُ إِلَى عَقِبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَأْخُذُهُ إِلَى رُكْبَتِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَأْخُذُهُ إِلَى حَقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ إِلْجَاماً»}[2].

**واتە: میقداد ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ، دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە ڕۆژی دواییدا خۆر لە بەندەکان نزیك دەکرێتەوە، تا لێیان نزیك دەبێ بە ئەندازەی میلێك، یان دوو میل، خۆرەکە دەیانتوێنتەوەو ئارەقەیان پێدەکات، هەر کەس بە پێی کردەوەکانیان لە نێو ئارەقە دان، هەیانە تا پاژنەپێی و، هەیانە تا ئەژنۆی، وە هەیانە تا ناوقەدی لە ئارەقدایە، وە هەشیانە (ئارەق) تا گوێ و لووتی دێ.**

**تێبینی: زۆر کەس وا دەزانن، هەموو کەس ئەوە حاڵیانە، بە باش و خراپەوە، بێگومان کە وانیە، چونکە سەرەتا دەبێ ئەوە بزانرێ کە قیامەت، ڕۆژی**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٧٣٧٧.

(٢) أخرجه أحْمَد: ٢٣٨٦٤، قال شعيب الأرنؤوط: إسناد صحيح، وَصَحَّحَهُ الألباني، انظر: «الصحيحة»: ١٣٨٢.

دوایی قۆناغ قۆناغە، لە قۆناغێکدا خوای پەروەردگار لە خەڵك ناپرسێتەوە، کە کاتی کۆکردنەوەیە جارێ تەنها کۆدەکرێنەوە، بەڵام دوایی لە قۆناغێکی دیکە کە (عَرْض) واتە: ڕانواندن و لێپرسینەوە دێتە گۆڕێ، ئنجا وەك گوتمان هەموو خەڵك حاڵیان وەك یەك نیە هەر کەس بە پێی چاکی و خراپی لە ناڕەحەتی دایە، با سەرنجی قورئان بدەین و پەیوەستی بکەین بە فەرموودە شرینەکانی پێغەمبەری خوا:

خوا باسی دیمەنێك و قۆناغێکی ڕۆژی دوایی دەکات، هەرگیز ناتوانرێ وێنا بکرێ لە زیهن و مێشك، دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾عبس.

واتە: کاتێ کە ڕۆژی دوایی هات . ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ لە براکەی ڕادەکات. (وە لە) دایك و باوکی (ڕا دەکات). (وە لە) هاوسەری و ڕۆڵەکانی (ڕا دەکات). هەر یەك لەوانە لەم ڕۆژەدا سەرقاڵی کارێکی وایە، ناپرژێتە سەر کاری هیچ کەسێك.

سبحان اللّه! لەو ڕۆژەدا کە ئەوە حاڵی خەڵکانێکە، دەبێ کەسانێکیش هەبن جیاوازبن لەوان، ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ ﴾عبس، واتە: زۆر کەس هەن لەو ڕۆژەدا ڕووخسار گەشاوەو جوانن . دەم بە پێکەنین و دڵخۆش، ئا لێرەدا دەبێ پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکەوە بە قوربانی بم بێتە دوان و تەفسیری ئەم حاڵەتەمان بۆ بکات، با سەرنجی فەرموودە شرینەکان بدەین:

**فەرموویەتی:** «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلالِي، الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لا ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي»[1].

---

(١) أخرجه مُسلِم: ٦٧١٣.

**واتە: بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: کوان ئەوانەی لەبەر من یەکتریان خۆش دەویست، ئا لەم ڕۆژەدا دەیانخەمە ژێر سێبەری خۆم، کە هیچ سێبەرێك نیە لەم ڕۆژەدا جگە لە سێبەری من.**

**هەروەها فەرموویەتی:** «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللّٰهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إلاَّ ظِلُّهُ، الإمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللّٰهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللّٰهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللّٰهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ يمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمالُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللّٰهَ خَالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ»[١].

**واتە: حەوت جۆرە کەس هەن خوا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری خۆی، (ئەوانیش:) پێشەواو دەسەڵاتدارێکی دادگەر، وە گەنجێك کە گەنجێتییەکەی لە عیبادەتی خوادا بەسەر بردبێ، وە پیاوێك کە دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە، وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکدیان خۆشبوێ و لەبەر خوا کۆببنەوەو لەبەر خوا لە یەکدی جیاببنەوە، وە پیاوێك ئافرەتێکی جوان و خاوەن دەسەڵات بانگی بکات (بۆ مەبەستی ئەنجامدانی کاری خراپ)، ئەویش بڵێ: من لە خوا دەترسم، وە پیاوێك خێرو چاکە بکات بە جۆرێك کە لای ڕاستی نەزانێ لای چەپی چی بەخشیوە (لە گێڕانەوەی دیکە هاتوە: لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی بەخشیوە)، وە پیاوێك بە تەنیابێ لە شوێنێکی چۆڵ زیکرو یادی خوا بکات و فرمێسك بە چاوەکانیدا بێنە خوار لە ترسی خوا.**

**وە فەرموویەتی:** «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً، أَوْ وَضَعَ لَهُ، أَظَلَّهُ اللّٰهُ فِي ظِلِّ عَرْشِهِ يَومَ الْقِيَامَةِ»[٢].

---

**(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٦٤٢١، وَمُسْلِم: ٢٤٢٧.**

**(٢) أخرجه أَحْمَد: ٨٦٩٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.**

واتە: هەر کەسێك چاوەڕوانی قەرزارێکی تەنگ دەست بکات (کە نیەتی بیداتەوە لە کاتی دیاریکراو)، یاخود هەر لێی خۆشبێ و وەرینەگرێتەوە، خوا دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی لە ڕۆژی قیامەت.

بەڵێ بەڕێزان ئا ئەو جۆرە کەسانەن کە خوا لە کۆتاییەکانی سوورەتی (عبس)دا وەسفیان دەکات بەوەی کەوا زۆر کەس هەن لەو ڕۆژەدا ڕووخسار گەشاوەو جوانن . دەم بە پێکەنین و دڵخۆش. اللّهُمَّ اجعلنا منهم.. آمین.

٥٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:«إِنَّ أَوَّلَ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَعْنِي العَبْدَ مِنَ النَّعِيمِ أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ، وَنُرْوِيَكَ مِنَ الـمَاءِ البَارِدِ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەمین شتێك لە نیعمەتەکان کە بەندە لە ڕۆژی دوایی پرسیاری لێ دەکرێتەوە ئەوەیە: پێی دەگوترێ: ئایا تەندروستی باشمان پێ نەبەخشی؟ ئایا ئاوی ساردمان پێنەدای؟!

٥٩- {«عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ؟ قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لا دِرْهَمَ وَلا مَتَاعَ لَهُ، قَالَ: إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا، وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا، فَيُقْضَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يَقْضِيَ مَا عَلَيْهِ، أَخَذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ، فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ»}[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا دەزانن موفلیس کێیە؟ (هاوەڵان) گوتیان: موفلیس لە نێو ئێمەدا کەسێکە کە نە

---

(١) أخرجه التِّرمِذِيّ: ٣٣٥٨، انظر: «صحيح الترمذي»: ٢٦٧٤.
(٢) أخرجه مُسْلِم: ٦٥٢٢.

درهەمی هەیە، نە ماڵ و کەل و پەلی هەیە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: مایە موفلیس لە ئۆممەتی من کەسێکە لە ڕۆژی قیامەت دێ نوێژی هەیە، ڕۆژووی هەیە، زەکات و صەدەقەی هەیە، بەڵام کە دێ جنێوی داوە بەمە، بوختانی بۆ ئەوە کردوە، ماڵی ئەوەی خواردوە، خوێنی ئەوی ڕشتوە، لەوی داوە، ئنجا لە چاکەکانی دەدرێ بەو خاوەن هەقانە تاکو هیچ چاکەی نامێنێ، ئنجا لە گوناهی خاوەن هەقەکان هەڵدەدرێتە سەر گوناهەکانی و بە گوناهەوە فڕێ دەدرێتە نێو دۆزەخ.

٦٠- {عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لا تَزُولُ قَدَما عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ؟ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ؟»}[1].

واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو پێی هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا (لە بەردەم دادگای خوای پەروەردگاردا) ناجووڵێ تاکو پرسیاری لێ نەکرێ: دەربارەی تەمەنی کە لە چیدا بە ڕێ کردوە؟ وە لە زانیاریەکەی لە چی و چەند کاری پێکردوە؟ وە لەو ماڵ و سامانەی کە هەیەتی چۆنی بە دەستهێناوە؟ چۆنیشی خەرج کردوە؟ وە جەستەی لە چیدا پیر کردوەو تەواو کردوە؟!

---

(١) أخرجه الترمِذِيُّ: ٢٤١٧، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ١٢٦.

## دەربارەی: ستەم و ستەمکاریی (الظُلْم)[1]

(الظُلْـمُ: وَضْعُ الشَّيْءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ، أَو تَجَاوُزُ الْحَدِّ)، واتە: ستەم: بریتیە لەوەی کە شتێك لە غەیری شوێنی خۆی دابنێی، یاخود بریتیە لە سنوور بەزاندن، جا کەسێك بێ لە جێی تەوحید ئیمان بە شیرك بێنێ، وە ئایەتەکانی خوا بە ڕاست دانەنێ، بە تەئکید ئەوە شتێکی زۆر بێ جێی کردوە، وە لە هەمان کاتیشدا سنووریشی بەزاندووەو سنوور شکێنی کردوە.

## ستەم (ظُلْم) سێ بەشە:

أ- زوڵمی مرۆڤ لە نێوان خۆی و خوادا، وەك: شیرك و کوفرو نیفاق و تاوان و سەرپێچی، وەك لوقمان بە کوڕەکەی گوت: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَـٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان.

بەڵێ، گەورەترین زوڵم ئەوەیە کە تۆ هاوبەشی بۆ خوا پەیدابکەی و، غەیری ئەو بپەرستی، کەچی ئەو تۆی دروست کردوە.

ب- زوڵمی مرۆڤ لە نێوان خۆی و خەڵکدا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾الشورى.

ج- زوڵم لە خۆ کردن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ ﴾فاطر، دیارە ستەم لە خۆ کردن هەردوو بەشەکانی دیکەش دەگرێتەوەو هەر گوناهێك بکەی ستەمت لە خۆت کردوە، چ شیرك بێ، چ مافی خەڵك

---

(١) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، سوورەتی (البقرة) ئایەتەکانی: (١٣٥ تا ١٤١).

**پێشێل بکەی، چ واجبێکی خوای پەروەردگار بچوێنی، یاخود قەدەغەیەکی بشکێنی، هەمووی بریتیە لە گوناهێك و لە ستەمێك کە بەرانبەر بە خۆت دەیکەی.**

٦١- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! هَذَا نَنْصُرُهُ مَظْلُومًا فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: «تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ»}[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: براکەت سەربخەو پشتی بگرە ستەمکار بێ، یان ستەم لێکراو، (یەکێك) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دیارە ستەم لێکراوەو سەری دەخەین، بەڵام ئایا چۆن ستەمکار سەربخەین؟ فەرمووی: دەستەکانی بگرەو مەهێڵە ستەم بکات.**

٦٢- {عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ، قَالَ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾هود}[٢].

**واتە: ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ماوەی ستەمکار دەدات، هەتا دەیگرێ، ئیدی کە گرتی دەرچوونی بۆ نیەو بەری نادات، دەڵێ: پاشان (پێغەمبەرﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾هود، **واتە: ئا بەو شێوەیە سزادانی پەروەردگارت، کاتێك خەڵکی شارەکان سزا دەدات و ئەوانیش زاڵمن، بەڕاستی تۆڵەسەندنی ئەو ئازاردەرو توندە.**

٦٣- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}[٣].

---

**(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢٣١٢.**

**(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ٤٦٨٦، وَمُسْلِم: ٢٥٨٣.**

**(٣) أخرجه البخاري: ٢٣١٥، والترمذي: ٢٠٣٠، وغيرهما.**

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ستەم کردن تاریکییەکانی ڕۆژی دواییە.**

٦٤- {عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ اقْتَطَعَ شِبْراً مِنَ الأَرْضِ ظُلْماً، طَوَّقَهُ اللَّهُ إِيَّاهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ»}[1].

**واتە: سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نوفەیل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بستێك لە زەوی خەڵکی دابڕێ و، بە ستەم دەست بەسەردا بگرێ، ئەوە لە ڕۆژی دوایی خوا لە هەر حەوت چینی زەوی دەیباتە خوارەوە.**

٦٥- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَمِعَ جَلَبَةَ خَصْمٍ بِبَابِ حُجْرَتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ ، فَقَالَ: «أَلا إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّمَا يَأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ، فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ، فَأَقْضِي لَهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنْ نَارٍ، فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا»}[2].

**واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێبیستی دەنگە دەنگێك بوو لە پێش دەرگای ژوورەکەی، جا چووە دەر بۆ لایان و پێی گوتن: بێگومان منیش مرۆڤم، ئنجا جاری وایە دێنە لام بۆ کێشەیەك (کە لە نێوانتانە) لەوانەیە هەندێکتان قسەی ڕەوانترو زمانی پاراوتر بێ لە هەندێکتان، وە منیش وا دەزانم ڕاست دەکات و هەقی پێدەدەم کەچی ئەوە هەقی مسوڵمانێکی دیکەیە، بەڵام بێگومان ئەوە پارچەیەکە لە ئاگر، جا با هەڵیبگرێ، یاخود وازی لێبێنێ.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٣١٩٨، وَمُسْلِم: ١٦١٠، وَاللَّفظُ لِمُسْلِم.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ: ٢٤٥٨، وَمُسْلِم: ٤٤٤٨.

٦٦- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَخْلُصُ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَيُحْبَسُونَ عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقْتَصُّ لِبَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ مَظَالِمُ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الجَنَّةِ، قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَحَدُهُمْ أَهْدَى بِمَنْزِلِهِ فِي الجَنَّةِ مِنْهُ لِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا»}[1].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کە بڕواداران لە ئاگر دەرباز دەبن (یانی: کاتێ بەسەر پشتی دۆزەخ تێپەڕ دەبن)، لە شوێنێك ڕادەگیرێن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ و تۆڵەیان بۆ وەردەگیرێتەوە، لە هەندێ لەو ستەم و دەستدرێژییانەی کە لە دونیا بەرانبەر یەکدی کردوویانە، هەتا پاکدەبنەوە، دوای پاکبوونەوە مۆڵەتیان دەدرێ بچنە بەهەشت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە، یەکێك لەوان بۆ جێگەو ڕێگەکەی خۆی لە بەهەشت شارەزاترە کە لە دنیادا دەچێتەوە ماڵی خۆی.**

٦٧- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ اَلْحَارِثِيُّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ اِقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الجَنَّةَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئاً يَسِيراً يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَإِنْ قَضِيبٌ مِنْ أَرَاكٍ»}[2].

**واتە: ئەبو ئەمامەی حاریسی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ماڵی مسوڵمانێك بە سوێند (ی درۆ) بۆ خۆی دابڕێ، ئەوە خوا ئاگری بۆ پێویست کردوە، وە بەهەشتیشی لێ قەدەغە دەکات! جا پیاوێك گوتی: ئەگەر شتێکی کەمیش بێ، ئەی پێغەمبەری خوا!؟ فەرمووی، ئەگەر سیواکێکیش بێ (لە داری ئەراك).**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢٤٤٠.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٣٥١.

٦٨- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانٍ»}[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو کەسێکی غەدرکارو ستەمکار لە ڕۆژی دوایی ئاڵایەکی هەیە، دەگوترێ: ئەوە فڵان غەدر کارە.**

٦٩- {عَنْ جَابِرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَحَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ»}[2].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم کردن، چونکە ستەم تاریکاییەکانی ڕۆژی دواییە، وە خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووکی، چونکە ڕەزیلی و چرووکی ئۆممەتەکانی پێش ئێوەی لە ناوبرد، وە وای لێکردن خوێنی یەکدیان ڕژاندو قەدەغەراوەکانی یەکدیان حەڵاڵ کرد.**

٧٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ مُسْتَجَابَةٌ، وَإِنْ كَانَ فَاجِراً فَفُجُورُهُ عَلَى نَفْسِهِ»}[3].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوعای ستەم لێکراو وەڵامدراوەیە ئەگەر کەسێکی خراپەکاریش بێ، چونکە خراپەکەی تەنیا بۆ خودی خۆیەتی.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٤٦٣١.

(٢) أخرجه البُخَارِيّ في الأدب المفرد: ٤٨٣، ومسلم: ٥٧٨.

(٣) أخرجه إبن أبي شيبة: ٢٩٩٨٧، انظر: «الصحيحة»: ٧٦٧.

## دەربارەی: بەهەشت و بەهەشتیەکان



**٧١-** {عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «إِنَّ فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ الأَرْضِ وَالسَّمَاءِ، وَالْفِرْدَوْسُ أَعْلاَهَا دَرَجَةً، وَمِنْهَا تُفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ الأَرْبَعَةُ، وَمِنْ فَوْقِهَا يَكُونُ الْعَرْشُ فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللّٰهَ، فَسَلُوهُ الفِرْدَوْس»}[١].

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی لە بەهەشت سەد پلە هەیە، نێوانی هەردوو پلە، بە ئەندازەی نێوان زەوی و ئاسمانە، وە فیردەوس بەرزترین پلەیە، لەوێوە چوار ڕووبارەکە هەڵدەقوڵێن: (ئاوی ساف و سازگار، هەنگوین، شەڕاب، شیر) وە لە سەرووی فیردەوسەوە عەرش هەیە، بۆیە ئەگەر پاڕانەوە لە خوا، داوای فیردەوس بکەن.**

**٧٢-** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا، أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَأَحَدُهُمْ بِمَنْزِلِهِ أَدَلُّ مِنْهُ فِي الدُّنْيَا»}[٢].

**واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك ئیمانداران ڕزگاریان دەبێ لە ئاگری دۆزەخ، قەتیس دەکرێن لە پردێك کە دەکەوێتە نێوان بەهەشت و دۆزەخ، لەوێ تۆڵەکانی دونیا وەردەگیرێنەوە (ئەوانەی ستەمیان کردوە، تۆڵەیان لێوەردەگیرێتەوە)، هەتا پاك و پوخت و پاڵفتە دەکرێنەوە، جا مۆڵەت دەدرێن بچنە بەهەشت، جا سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، هەر یەکێکیان باشتر لە دونیا شوێن و ماڵی خۆی پێ دەزانێ (لە بەهەشتدا).**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢٦٣٧، وَالترْمِذِيّ: ٢٥٣١، واللَّفْظُ لَهُ.

(٢) أخرجه أحمد: ١١٦٢١، والبخاري: ٢٣٠٨، وابن حبان: ٧٤٣٤.

**٧٣-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَشَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ سَنَةٍ، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ»: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾﴾ الواقعة}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە بەهەشتدا درەختی وا هەیە کە سواریەك سەد ساڵ بە ژێر سێبەرەکەیدا دەڕوات و تەواوی ناکات (ئەوەندە بەرزەو سێبەرەکەی ئەوەندە درێژو پانە)، (پاشان فەرمووی:) ئەگەر دەتانەوێ ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾﴾ الواقعة، واتە: وە سێبەرێکی لێك کێشراوەی دوورو درێژ.**

**٧٤-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کۆمەڵێك دەچنە بەهەشت، دڵیان وەك دڵی باڵندەیە.**

**تێبینی: مەبەست لێرەدا ئەوەیە دڵیان وەك دڵی باڵندە ناسك و لاوازە، لەو لایەنەی کە ترسی خوایان زۆر لە دڵە، وە باڵندە یەکێکە لەو ئاژەڵانەی کە خوا وای دروست کردوە زۆر بە ترسەو لە هەموو شت دەترسێ و، ڕادەچڵەکێ، جا کەسی وا هەیە هەر ناوی خوا دێ دەست بە گریان دەکات، کەسی وا هەیە دوو سیفەتی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ باس بکەن، ئیتر ئەوە خۆی بۆ ناگیرێ و خەریکە دڵی لە کار بکەوێ و، فرمێسك لە چاوانی دێنە خوار، ئا ئەوانە کەسانی زۆر تایبەتمەندن لە لای خوای پەروەردگار.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيُّ: ٣٢٥٢، وَمُسْلِم: ٢٨٢٨.

(٢) أخرجه أحمد: ٨٣٦٤، ومسلم: ٢٨٤٠.

وە ئەگەر چاو بە سیرەو ژیاننامەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیاندا بگێڕیەوە، کەسانی وات زۆر دەکەونە بەر چاو، کە فیعلەن دڵیان وەك دڵی باڵندە بووە لە ناسکی و نەرمی، جا پێشەوا حەسەنی بەسریی[1] دەڵێ: هاوەڵیەتی کەسانێکم کردوە، ئێوە چەند ترستان هەیە بە هۆی گوناهەکانتانەوە سزا بدرێن، ئەوان زیاتر لە ئێوە ترسیان هەبوو چاکەکانیان بە چاودا بدرێتەوەو لێیان قبووڵ نەکرێ.

**٧٥-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَهْلُ الْجَنَّةِ جُرْدٌ مُرْدٌ كُحْلٌ، لا يَفْنَى شَبَابُهُمْ، وَلا تَبْلَى ثِيَابُهُمْ»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەهەشت نە جەستەیان مووی پێوەیە، نە ڕووخساریان ڕیشی پێوەیە، چاویان ڕەشکراوە، هەرگیز گەنجێتیان لە نێو ناچێت و، پۆشاکیان کۆن و شڕ نابێت.**

**٧٦-** {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا وَيَشْـرَبُونَ، وَلاَ يَتْفُلُونَ، وَلاَ يَبُولُونَ، وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، وَلاَ يَمْتَخِطُونَ»، قَالُوا: فَمَا بَالُ الطَّعَامِ؟ قَالَ: «جُشَاءٌ وَرَشْحٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالتَّحْمِيدَ كَمَا يُلْهَمُونَ النَّفَسَ»}[3].

**واتە: جابر ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەهلی بەهەشت دەخۆن و دەخۆنەوە، بەڵام نە تفیان هەیە، نە میزیان هەیە، نە پیساییان هەیە، نە بەڵغەم و چڵمیان هەیە، گوتیان: ئەدی ئەو خواردن و خواردنەوەی دەیخۆن چی لێدێ؟ فەرمووی: دەبێتە قرپ و ئارەقە وەك بۆنی میسك وایە (کە قرپیان دێتەوە، وە ئەو ئارەقەی کە لە**

---

(١) من «مواعظ ابن الجوزي» ص ٩١، بترقيم الشاملة .

(٢) أخرجه الترمذي: ٢٥٣٩، انظر: «صحيح الجامع»: ٢٥٢٥.

(٣) أخرجه أحمد: ١٤٨١١، ومُسْلِم: ٢٨٣٥، واللَّفظُ لأحْمَد رَحِمَهُ الله.

بەدەنیان دەردەچێ، بۆنەکەی وەك میسکە کە خۆشترین بۆنە)، وە خوا بە پاك دەگرن و ستایشی دەکەن، وەك چـۆن ئێوە هەناسە دەدەن، بەبێ مـاندوو بوون.

تێبینی: دیارە ئەو حاڵەتانەی بۆ ئەهلی دونیا هەن لە ژیانی دونیادا وەك هەبوونی پاشەڕۆو ئەو کەم و کوڕیانەی دیکە کە هەن، زادەی ئەو جەستە ماددیەن کە بۆ دونیا دروستکراوە، بەڵام لە بەهەشتدا ئەهلی بەهەشت بە پیاوو ئافرەتەوە، ڕووحێکی زۆر پاك و جەستەیەکی زۆر پتەوو چاکیشیان دەبێ، کە ئەو کەم و کوڕییانەی کە لە ڕووح و جەستەی دونیادا پەیدادەبن لەوێ پەیدانابن.

جا ئەو جۆرە گۆڕانکاریانە سەیرو سەمەرە نین بۆ مرۆڤی عاقڵ، چونکە هەر کەش و قۆناغێك پێویستی بە ئالیەتێکی ژیان هەیە، ئەوەتا کاتێ منداڵین و لە سکی دایکمان داین میزو پاشەڕۆ دەرنادەین بە ئەندامەکانی پێشەوەو دواوە، وە هەناسە نادەین بە دەم و لوت، بەڵکو دەم و لوت داخراون و کاری هەناسەدان ناکەن، کەچی کاتێ دێینە دونیا لە چرکەساتی یەکەمەوە ئەگەر دەم و لوتمان بگرن دەخنکێین، چونکە ئەو ژیان و قۆناغە گۆڕا، بەهەشتیش بە هەمان شێوە ئالیەتی تایبەتی خۆی دەوێ، ناکرێ شوێنێکی وەکو بەهەشت تاڵە موێکی لێ بکەوێت، چونکە شوێنێکی پاکەو بۆ پاکانەو، پێویستی بە ئالیەتی تایبەتی خۆی هەیە.

٧٧- {«عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ، فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوئِهِ وَحَاجَتِهِ، فَقَالَ لِي: سَلْنِي، فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ؟ قَالَ: أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ»}[١].

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ١١٢٢.

**واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعب ﷺ، دەڵێ: من شەوان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەبووم، ئاوی دەستنوێژم بۆ دەهێنا، پێداویستیەکانم بۆ دەهێنا خزمەتم دەکرد، پێی گوتم داوام لێ بکە چ شتێکت لە من دەوێ؟ منیش گوتم: داوات لێدەکەم لە بەهەشت ڕەفیقی تۆ بم! فەرمووی: جگە لەوە چی دیکە؟ دەڵێ گوتم: هەر ئەوە، فەرمووی: کەواتە: یارمەتیم بدە لەسەر خۆت بە زۆر سوجدە بردن.**

**٧٨-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ»}[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەهەشت بە ناڕەحەتیان پەرژین کراوە، دۆزەخیش بە ئارەزووەکان پەرژین کراوە.**

**تێبینی: واتە: کەسێك بیەوێ بەرەو بەهەشت بڕوا دەبێ تەحەمولی سەختی و ناڕەحەتی زۆر بکات کە لە جێ بەجێکردنی واجبەکان و خۆگرتنەوە لە قەدەغەکان، خۆی دەنوێنێ، بەڵام کەسێك بە دوای ئارەزووەکانی بکەوێ ئەوە شووراو پەرژینی دۆزەخ دەبڕێ و دەچێتە نێو دۆزەخەوە.**

**٧٩-** {عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَاهُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا نَسَمَةُ الْمُؤْمِنِ طَائِرٌ يَعْلُقُ فِي شَجَرِ الجَنَّةِ، حَتَّى يُرْجِعَهُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى جَسَدِهِ يَوْمَ يَبْعَثُهُ»}[٢].

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە، کە باوکی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕووحی ئیماندار باڵندەیەکە خۆی بە درەختەکانی بەهەشت هەڵدەواسێ،**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٧٠٦١.

(٢) أخرجه أَحْمَد: ١٥٨١٦، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح.

**هەتاکو خوا تبارك وتعالى دەیگێڕێتەوە بۆ نێو جەستەکەی لە ڕۆژێکدا کە زیندووی دەکاتەوە.**

٨٠- {«عَنْ أَبِي أَيُّوب ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ للنَّبِيِّ ﷺ: أَخْبِرْنِي بِعَمَل يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ، قَالَ: «تَعْبُدُ اللّهَ، وَلاَ تُشْـرِكُ بِهِ شَيْئَاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ»}[١].

**واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ، دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوت: هەواڵم پێبدە بە کردەوەیەك (کە بیکەم و) بمباتە بەهەشتەوە، فەرمووی: خواپەرستەو هیچ شتێکی بۆ بە هاوەڵ دامەنێ، وە نوێژ بەرپابکەو چاك ئەنجامی بدە، زەکاتیش لە ماڵەکەت دەربکە، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنە (واتە: ئەوانە سیفەتی بەهەشتیانن).**

٨١- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الجَنَّةَ؟ فَقَالَ: «تَقْوَى اللّهِ، وَحُسْنُ الخُلُقِ»، وَسُئِلَ عَن أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ؟ فَقَالَ: «الفَمُ وَالفَرْجُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا لە باشترین شتێك کە زۆرترینی خەڵکی دەخاتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: پارێزکاریی و ڕەوشتی جوانە، وە پرسیاری لێکرا لەوە کە چ شتێك زۆرترینی خەڵکی دەخاتە دۆزەخ؟ فەرمووی: زمان و داوێن.**

٨٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَّامٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَيُّهَا اَلنَّاسُ! أَفْشُوا السَّلَامَ، وَصِلُوا الْأَرْحَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا اَلْجَنَّةَ بِسَلَامٍ»}[٣].

---

(١) أخرجه البُخاريُّ: ١٣٣٢، وَمُسْلِم: ١٣.

(٢) أخرجه البُخَارِيُّ في «الأدب المفرد»: ٢٩٤.

(٣) أخرجه إِبْنُ مَاجَهْ: ١٣٣٤، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٦١٦.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! سڵاو بڵاوبکەنەوەو، پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنن و، خواردن بدەن بە خەڵك، وە بە شەو کە خەڵك خەوتووە نوێژ بکەن، (ئەگەر ئەوانە بکەن) بە سەلامەتی دەچنە بەهەشت.**

**٨٣-** {عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللّٰهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ جُلُوساً فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، لَيْلَةَ أَرْبَعَ عَشْـرَةَ فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ»}[1].

**واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، تەماشای مانگی کرد لە شەوی چواردەدا، فەرمووی: بە دڵنیایی ئێوە پەروەردگاری خۆتان دەبینن وەکو چۆن مانگ لە شەوی چواردەدا دەبینن بە ڕوونی، وە پێویستیتان بە بۆچوونە لای یەکدی نابێ کە ئاخۆ خوای پەروەردگار دەرکەوت، یان نا (وەك پێویستیتان بە بۆچوونە لای یەکدی و کۆبونەوەتان نابێ لە کاتی بینینی مانگدا).**

**٨٤-** {عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ أُمَّتِي يَدخُلُونَ الجَنَّةَ إِلاَّ مَنْ أَبَى»، قِيلَ: وَمَنْ يَأْبَى يَا رَسُولَ اللّٰه؟ قَالَ: «مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئۆممەتی من دەچنە بەهەشت مەگەر کەسێك پشت هەڵبکات، گوتیان: کێ پشت هەڵدەکات؟ فەرمووی: هەر کەسێك فەرمانبەریی من بکات دەچێتە بەهەشت، وە هەر کەسێك سەرپێچی فەرمانی من بکات بێگومان پشتی هەڵکردوە لە چوونە بەهەشت.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٥٢٩.

(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ٦٨٥١.

٨٥- {عَنْ عُتْبَةَ بْنَ عَبْدِ السُّلَمِيِّ ﷺ يَقُولُ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنِ الحَوْضِ؟ وَذَكَرَ الجَنَّةَ، ثُمَّ قَالَ: الأَعْرَابِيُّ فِيهَا فَاكِهَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَفِيهَا شَجَرَةٌ تُدْعَى طُوبَى»}[1].

واتە: عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمی ﷺ، دەڵێ: عەڕەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد دەربارەی حەوز (ی کەوسەر)، وە (پێغەمبەر ﷺ) باسی بەهەشتی کرد، پاشان (پیاوە) خێڵەکیەکە گوتی: ئایا لە بەهەشتدا میوە هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، هەروەها درەختێکی تێدایە پێی دەگوترێ: طوبا.

## قسەیەکی خۆش

## دەربارەی ژن و پیاوێك (ی بەهەشتی بە حیسابی ژنەکە)

یەکێك لە موفەسیرینی قورئان[2] بەسەرهاتێکی هێناوە، قسەیەکی خۆشە دەربارەی ژن و مێردێك دەگێڕێتەوە:

دەڵێ: عیمرانی کوڕی حیتانی خارجی (پیاوێك بووە لە خەواریجەکان) کەسێکی زۆر ڕەش پێســـت بووە، (ڕەش پێستێکی زۆر تـــۆخ بووە)، وە خێزانێکیشی هەبووە زۆر جوان بووە:

دەڵێ: ڕۆژێ خێزانەکەی تەماشای مێردەکەی خۆی دەکات و چاوی پێدا دەگێڕێ!! دوایی دەڵێ: (الحمد لله) ستایش بۆ خوا..

مێردەکەشی لێی دەپرسێ: ژنەکە بۆچی وات گوت؟! بۆچی سوپاس و ستایشی خوات کرد؟ (وەك بڵێی هەستی پێکردبێ ئەم زیکرە شتێکی تێدابێت)!!

---

(١) أخرجه أحْمَد: ١٧٦٧٩، قال شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ لِغَيْرِهِ.

(٢) الكشاف: ج١، ص٤٢٨.

**ژنەکە دەڵێ: وەڵڵاهی پیاوەکە، سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەوەی کە من و تۆ هەردووکمان بەهەشتین!**

**پیاوەکە دەڵێ: چۆن زانیت بەهەشتین؟**

**ژنەکە دەڵێ: تۆ منت بە نسیب بووە، وە سوپاسی خوات کردوە، کە بۆ خۆت هێندە ڕەشی و، ئافرەتێکی هێندە جوانت بە نسیب بووە، منیش کە تۆم بە نسیب بووە (واتە: هێندە ناشیرینیشی)، بەڵام صەبرم لەسەر گرتووی! ئێ خوای گەورەش بەڵێنی داوە کە سوپاسگوزاران و ئارام گران ئەهلی بەهەشتن!**

**ئەوەش بۆ دڵخۆشیتان..**

## دەربارەی: دۆزەخ و دۆزەخیەکان

٨٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا، مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ»، قَالُوا: وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّهَا مِثْلُ حَرِّهَا»}[1].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو ئاگرەتان کە مرۆڤ دایدەگیرسێنێ، (گەرمیەکەی) بەشێکە لە حەفتا بەشی گەرمی (ئاگری) دۆزەخ، گوتیان: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر هەر ئەو ئاگرەی دونیاش بێ بەسە (تا لێی بترسین)، فەرمووی: بێگومان ئەو ئاگرەی دونیا شەست و نۆ بەشی دیکەی دەخرێتە سەر (لە دۆزەخ)، هەر کامێکیان هەمان گەرمی هەیە.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٨٤٣.

٨٧- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَمَنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمَنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ»}[١].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کات کە یەکێکتان مرد بەیانیان و ئێواران شوێنی خۆی پێشان دەدرێ، ئەگەر ئەهلی بەهەشت بێ، ئەوە لە بەهەشتیەکانەو، ئەگەر ئەهلی دۆزەخ بوو، ئەوە لە دۆزەخیەکانە، پێی دەگوترێ: ئەمە شوێنی تۆیە هەتا خوا لە ڕۆژی دوایی زیندووت دەکاتەوە بۆی.**

٨٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ أَهْلِ النَّارِ يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ: لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي، فَيَكُونُ عَلَيْهِ حَسْرَةً "قَالَ:" وَكُلُّ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، فَيَقُولُ: لَوْلَا أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي. قَالَ: فَيَكُونُ لَهُ شُكْراً»}[٢].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو دۆزەخیەك جێگەی خۆی دەبینێ لە بەهەشتدا، دەڵێ: ئەگەر (کردەوەی چاکم کردبایەو) خوا ڕێنمایی کردبام ئەوە جێگەو ڕێگەی من بوو، کە ئەمە مایەی خەم و خەفەتە بۆیان، وە هەموو بەهەشتیەکیش جێگەی خۆی دەبینێ لە دۆزەخدا، دەڵێ: ئەگەر خوا ڕێنمایی نەکردبام، ئەوە جێگەو ڕێگەم دەبوو، ئەوەش دەبێتە (دڵخۆشیی و) سوپاسگوزاریی بۆی.**

٨٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَا يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَهُودِيٌّ، أَوْ نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَا يُؤْمِنُ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ، إِلَّا كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ»}[٣].

---

**(١) أخرجه مُسلِم: ٧٣٩٠.**
**(٢) أخرجه أحْمَد: ١٠٦٦٠، قال شعيب الأرنؤوط: إسْنَادُهُ صَحِيح عَلىَ شَرْط البُخَارِي.**
**(٣) أخرجه مُسلِم: ٣٨٤.**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە (سوێندی پێغەمبەر ﷺ بە زۆری ئاوا بووە) گوێ بیستی (ناوی) من نابێ لەم ئوممەتە، هیچ کەسێکی جوولەکەو نەصرانیی، پاشان ئیمان بەوە نەهێنێ کە پێمدا ڕەوانە کراوە، ئەوە مسۆگەر دەچێتە دۆزەخ و هاوەڵی دۆزەخە.

٩٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي، وَقَالَ: وَيْلٌ لَهُ، وَيْلٌ لَهُ، أُمِرَ هَذَا بِالسُّجُودِ، فَأَطَاعَ، فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بالسُّجُود، فَعَصَيْتُ، فَلِيَ النَّارُ»}[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك ئادەمیزاد ئایەتی سەجدە دەخوێنێ و کڕنووش دەبات بۆ خوا، شەیتان دوور دەکەوێتەوەو دەگریێ، دەڵێ: هاوار بۆ من، ئادەمیزاد فەرمانی پێکرا بە کڕنووش بردن، کڕنووشی برد، وە بە بەهەشتی مسۆگەر کرد، منیش فەرمانم پێکرا بە کڕنووش بردن سەرپێچیم کردو بەشم ئاگرە.

٩١- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَدْخُلُ النَّارَ أَقْوَامٌ مِنْ أُمَّتِي حَتَّى إِذَا كَانُوا حُمَمَاً أُدْخِلُوا الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ أَهْلُ الْجَنَّةِ: مَنْ هَؤُلَاءِ؟ فَيُقَالُ: هُمْ الْجَهَنَّمِيُّونَ»}[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسانێك دەچنە نێو دۆزەخەوە لە ئوممەتی من، هەتا کاتێك کە دەسووتێن و ڕەش هەڵدەگەڕێن (واتە: دەبنە ڕەژوو، ئنجا) لێی دەردەهێنرێن و، دەخرێنە بەهەشتەوە، خەڵکی بەهەشت دەڵێن: ئەوانە کێن؟ پێیان دەگوترێ: ئەوانە دۆزەخیەکانن.

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٨١.
(٢) أخرجه أَحْمَد: ١٢٢٨٠، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

٩٢- {عَنْ قَتَادَةَ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُجَاءُ بِالْكَافِرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ لَهُ: أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ مِلْءُ الْأَرْضِ ذَهَباً أَكُنْتَ مُفْتَدِياً بِهِ، فَيَقُولُ: نَعَمْ يَا رَبِّ، قَالَ: فَيُقَالُ: لَقَدْ سُئِلْتَ أَيْسَرَ مِنْ ذَلِكَ فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِمْ مِلْءُ الْأَرْضِ ذَهَباً وَلَوْ افْتَدَى بِهِ ﴿٩١﴾ ﴾آل عمران»}[١].

**واته: قەتاده دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسی کافر ڕۆژی قیامەت دەهێنرێ، پێی دەگوترێ: ئایا ئەگەر پڕی زەوی زێڕت هەبووایە، ئێستا نەتدەبەخشی (تا ببێتە بەلا گێڕەوەت و خۆت پێ دەکڕیەوە تا نەچیتە دۆزەخ)؟ دەڵێ: با، ئەی پەروەردگارم، دەڵێ پێی دەگوترێ: لەوە زۆر ئاسانترت لێ داواکرا (لە دونیادا، بەڵام جێبەجێت نەکرد)، ئەویش ئەوەیە کە خوا (عَزَّ وَجَلَّ) دەفەرموێ:** ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِمْ مِلْءُ الْأَرْضِ ذَهَباً وَلَوْ افْتَدَى بِهِ ﴿٩١﴾ ﴾، **واته: بەڕاستی ئەوانەی بێبڕوا بوون، وە بە بێ بڕواییش مردن، ئەوە هەرگیز فیدیە (تا ببێتە بەلا گێڕەوە) لە هیچ کامێکیان وەرناگیرێ، با پڕ بە هەموو زەویش زێڕ بێت و بیبەخشێت لە بریدا، وە ئەوانە سزای بە ئازاریان بۆ هەیەو، هیچ سەرخەرێکیان نیە.**

٩٣- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً، ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ خَيْراً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا، وَاللَّهِ يَا رَبِّ! وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْساً فِي الدُّنْيَا، مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا، وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلَا رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ»}[٢].

---

(١) أخرجه أحمد: ١٣٢٨٨، والبُخَارِيّ: ٦٥٣٨، وَمُسْلِمٌ: ٧٠١٦.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٢٨٠٧.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی دوایی کەسێکی دۆزەخی دێنن کە لە خۆشترین نیعمەتی دونیادا بووە، جارێك دەخرێتە نێو ئاگر، ئنجا پێی دەگوترێ: ئەی نەوەی ئادەم! ئەرێ هەرگیز هیچ نیعمەتێکت بینیوە؟ ئایا هیچ کات لە خێرو خۆشیدا بووی؟ دەڵێ: نەخێر، وەڵڵاهی ئەی پەروەردگارم! وە کەسێکی بەهەشتی دەهێنرێت کە لە هەژارترین و بە نەهامەتترین کەس بووە لە دونیا، جارێك دەخرێتە نێو بەهەشت، ئنجا پێی دەگوترێ: ئەی نەوەی ئادەم! ئەرێ هەرگیز هەژاری و نەهامەتیت بینیوە؟ ئایا هیچ کات لە ناڕەحەتیدا بووی؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر، وەڵڵاهی ئەی پەروەردگارم! هەرگیز بە ناڕەحەتیدا تێنەپەڕیوم، وە هەرگیز ناڕەحەتیم نەبینیوە!

٩٤- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ، وَأَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ، جِيءَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ يُذْبَحُ، ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، لَا مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ، فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحاً إِلَى فَرَحِهِمْ، وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْناً إِلَى حُزْنِهِمْ»}[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بەهەشتیەکان بۆ بەهەشت و دۆزەخیەکان بۆ دۆزەخ بردران، مردن دەهێنرێ و لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ[٢] سەردەبڕدرێ، ئنجا بانگ بێژێك بانگ دەکات: ئەی خەڵکی بەهەشت مردن نەما، وە ئەی خەڵکی دۆزەخ مردن نەما، ئنجا خەڵکی بەهەشت دڵخۆشتر دەبن بە خۆشیەکەیان و دۆزەخیەکانیش هێندەی تر خەفەتبارو دڵ تووندتر دەبن.

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٦١٨٢.

(٢) لە شێوەی ئاژەڵێك، وەك لە فەرموودەی دیکە باس کراوە.

## دەربارەی: ماڵی چاك بۆ پیاوی چاكە

٩٥- {عَنْ عَمْرَو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ عَلَيَّ ثِيَابِي وَسِلَاحِي، ثُمَّ آتِيهِ، فَفَعَلْتُ فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَصَعَّدَ إِلَيَّ الْبَصَرَ ثُمَّ طَأْطَأَ، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَمْرُو! إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَبْعَثَكَ عَلَى جَيْشٍ فَيُغْنِمُكَ اللَّهُ، وَأَرْغَبُ لَكَ رَغْبَةً مِنَ الْمَالِ صَالِحَةً»، قُلْتُ: إِنِّي لَمْ أُسْلِمْ رَغْبَةً فِي الْمَالِ، إِنَّمَا أَسْلَمْتُ رَغْبَةً فِي الإِسْلَامِ فَأَكُونُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا عَمْرُو! نِعْمَ الْمَالُ الصَّالِحِ لِلْمَرْءِ الصَّالِحِ»}[1].

**واتە: عەمرِی کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دوایدا ناردم و فەرمانی پێکردبووم پۆشاك و چەکم هەڵبگرم و بچمە خزمەتی، منیش وام کردو، چوومە خزمەتی، لە کاتێکدا دەستنوێژی هەڵدەگرت، چاوی بەرز کردەوە بۆ لای من (تەماشای کردم)، دواتر سەری داخست، پاشان فەرمووی: ئەی عەمرِ! دەمەوێ بتنێرم بۆ سەر سوپایەك و، خوا دەستکەوتی جەنگت پێبدات، وە پێم خۆشە ماڵێکی چاکت دەستبکەوێ، دەڵێ: منیش گوتم: من بۆ ئەوە مسوڵمان نەبووم ماڵ و سامانم دەست بکەوێ، بەڵکو من لە خۆشی ئەوە هاتمە نێو ئیسلام و مسوڵمان بووم تاوەکو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بم، فەرمووی: ئەی عەمرِ! باشترین (نیعمەت) ماڵی چاکە، بۆ پیاوی چاك.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ في الأدب المفرد: ٢٩٩، انظر: المشكاة (٣٧٥٦/ التحقيق الثاني).

## دەربارەی: مامەڵە کردن (کڕین و فرۆشتن)



٩٦- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلاً، فَقَالَ: «مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟»، فَقَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! قَالَ: «أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ حَتَّى يَرَاهُ النَّاسُ»، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنَّا»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای (خواردنێکی لەسەر یەك کەڵەکە بوو) تێپەڕی، دەستی خستە نێوی (ژێرەوەی)، پەنجەکانی تەڕ بوون، فەرمووی: ئا ئەمە چیە ئەی خاوەنی خواردن؟! گوتی: باران تەڕی کردوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەی بۆچی لە سەرەوەی خواردنەکە داتنەناوەو دەرتنەخستوە بۆ ئەوەی خەڵك ببینێ؟! پاشان فەرمووی: هەر کەسێك فێڵ بکات لە ئێمە نیە.**

**تێبینی: واتە: ئەم کردەوەی ئەو کەسە کە فێڵ کردنە لە ڕەفتاری مسوڵمان ناچێ! نەك لە ئیسلام دەربچێ و کافر بێت، مەگەر فێڵەکەی، فێڵێك بێت لە عەقیدە تەواو نەبێت و زیانی عەقیدەی لە مسوڵمانان بدات، ئا ئەوە حوکمەکەی جیاواز دەبێت.**

٩٧- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَسْتَقْبِلُوا، وَلاَ تُحَفِّلُوا، وَلاَ يُنفِّقُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ»}[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێ لەو کەسانە مەگرن لە گوندەکانەوە دێن کاڵایان پێیە (کە هێشتا ئاگاداری نرخی بازاڕ نین و بە هەرزان لێیان بکڕنەوەو لە**

---

**(١) أخرجه مُسْلِم: ٢٩٥، والتِرْمِذِيّ: ١٣١٥، وأبو يعلى: ٦٥٢٠، وابن حبان: ٤٩٠٥.**

**(٢) أخرجه التِرْمِذِيّ: ١٢٦٨، انظر: «صحيح الجامع»: ٧٣٢٤.**

**دەستیان دەربێنن)، وە سوێندان مەخۆن لە کڕین و فرۆشتن، هیچ کەسێکتان لەسەر ئەویترتان نرخ بەرز نەکاتەوە (لە کاتی کڕین و فرۆشتن، بۆ ئەوەی کەسی کڕیار هەڵبخەڵەتێنێ، وا بزانێ ئەم کاڵایە ئەو نرخە دێنێ و دوایی بە کەسێك لە ئامادەبووان ساغ بکەنەوە).**

**٩٨-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَبِعِ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلاَ يَخْطُبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ إِلاَّ أَنْ يَأْذَنَ لَهُ»}[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك مامەڵە لەسەر مامەڵەی براکەی نەکات، وە هیچ کەسێکتان خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی برایەکەیدا (بۆ هەمان کەس) مەگەر خۆی مۆڵەتی پێ بدات.**

**٩٩-** {عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْتِينِي الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنِّي الْبَيْعَ، لَيْسَ عِنْدِي أَفَأَبْتَاعُهُ لَهُ مِنَ السُّوقِ؟ فَقَالَ: «لاَ تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ»}[2].

**واتە: حەکیمی کوڕی حیزام رضي الله عنه دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کەسێك دێتە لام و دەیەوێ شتێکم لێ بکڕێ، منیش ئەو شتەم لەلا نیە، ئایا (دروستە) لەبازاڕ بۆی بکڕم (واتە: پێشتر پێی بفرۆشم، ئنجا بچم لە بازاڕ بیکڕم و بیدەمە دەستی)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: شتێك مەفرۆشە، کە لە لات نیە. (کەواتە: دروست نیە مامەڵە لەسەر شتێك بکرێ کە هێشتا موڵکی فرۆشیار نەبێ).**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢٠٣٢، وَمُسْلِم: ٣٥٢١، واللَّفظُ لِمُسْلِم.

(٢) أخرجه أحْمد: ١٥٣٤٧، انظر: «صحيح الجامع»: ٧٢٠٦.

١٠٠- {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ التَّمْرَ فِي السُّوقِ، فَأَقُولُ: كِلْتُ فِي وَسْقِي هَذَا كَذَا فَأَدْفَعُ أَوْسَاقَ التَّمْرِ بِكَيْلِهِ، وَآخُذُ شِفِّي فَدَخَلَنِي مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِذَا سَمَّيْتَ الكَيْلَ فَكِلْهُ»}[١].

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: من خورمام دەفرۆشت لە بازاڕ، (بە کڕیارم) دەگوت: من پێشتر ئەو ئەندازەیەم پێوانە کردوە، هەر لەسەر پێوانەی پێشوو ئەندازە خورمایەکەم بۆ دەکێشا، وە قازانجی خۆمم وەردەگرت، جا گومانم بۆ دروست بوو لەو بابەتەدا، بۆیە لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسی (کە ئاخۆ دەبێت بۆی نەکێشمەوەو لەسەر کێشان و پێوانەی پێشوو پێی بفرۆشم)، ئەویش فەرمووی: ئەگەر باسی ئەندازەکەت کرد بیکێشەوە (واتە: دووبارە بۆ موشتەری پێوانەی بکەوە با گومان بۆ تۆ و بۆ موشتەری نەمێنێ).**

١٠١- {عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الحَلِفِ فِي البَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ»}[٢].

**واتە: ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: خۆتان بپارێزن لە زۆر سوێند خواردن لە کاتی فرۆشتندا، چونکە سوێند خواردن کاڵاتان پڕفرۆش دەکات و دواییش پێزو بەرەکەتی ناهێڵێ.**

١٠٢- {عَنْ عُثْمَان بْن عَفَّانَ ﷺ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَدْخَلَ اللَّهُ الجَنَّةَ رَجُلاً كَانَ سَهْلاً بَائِعاً وَمُشْتَرِياً»}[٣].

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا پیاوێکی خستە بەهەشتەوە، (چونکە) ئاسانکارو لێبوردەو ڕووخۆش بوو لە کاتێ کە فرۆشیار بوو، وە لە کاتێکیش کە کڕیار بوو.**

---

(١) أخرجه إِبْنُ مَاجَه: ٢٢٣٠، انظر: «صحيح الجامع»: ٧٢٠٦.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٤٢١٠.

(٣) أخرجه إِبْنُ مَاجَه: ٢٢٠٢، انظر: «صحيح الجامع»: ١٧٨.

١٠٣- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «إِنَّمَا البَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ»}[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕین و فرۆشتن دەبێ بە ڕەزامەندیەوە بێ (واتە ڕەزامەندی هەردوو لای لەسەر بێت).**

١٠٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَقَالَ مُسْلِمَاً، أَقَالَهُ اللَّهُ عَثْرَتَهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕازی بێ بە پەشێمان بوونەوەی مسوڵمانێك لە مامەڵەکەی، ئەوە خوا لە کاتی کەوتن و ناڕەحەتی (دونیاو دواڕۆژ) لە فریای دێ.**

## دەربارەی: ڕیباو سوو خواردن

١٠٥- {عَنْ أُسَامَةُ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا الرِّبَا فِي النَّسِيئَةِ»}[٣].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان سوو لە قەرزی دواخراو دایە، (بۆ نموونە: ملیۆنێك بە قەرز دەدرێ، بۆ ماوەی ساڵێك، بەو مەرجەی ملیۆنێك زیاتر بدرێتەوە خاوەن قەرز).**

١٠٦- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِذَا ظَهَرَ الزِّنَـا وَالرِّبَا فِي قَرْيَةٍ، فَقَدْ أَحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عَذَابَ اللّه»}[٤].

---

**(١) أخرجه إِبْنُ مَاجَهْ: ٢١٨٥، انظر: «صحيح الجامع»: ٥٠٢٩.**

**(٢) أخرجه أَبُو دَاوُد ٣٤٦٢، انظر: «صحيح إبن ماجه»: ١٧٨٦.**

**(٣) أخرجه مُسْلِم: ٤١٧٣.**

**(٤) أخرجه الطَّبَرَانِي في «الكبير»: ٤٦٠، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ١٨٥٩.**

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر داوێن پیسی و سووخۆری لە هەر شوێنێك پەیدابوو، بە دڵنیایی ئەوانە سزای خوایان بۆ خۆیان مسۆگەر کردوە.**

**١٠٧-** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الآخِذُ وَالْمُعْطِي سَوَاءٌ فِي الرِّبَا»}[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی سوو وەردەگرێ، وە ئەو کەسەش کە سوو دەدات وەك یەکن لە سووخۆری (بە مەرجێك سوو لێ وەرگیراو قاصد بێت).**

**١٠٨-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «التَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالحِنْطَةُ بِالحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالـمِلْحُ بِالـمِلْحِ مِثْلاً بِمِثْلٍ، يَداً بِيَدٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزَادَ فَقَدْ أَرْبَى إِلاَّ مَا اخْتَلَفَتْ أَلْوَانُهُ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خورما بە خورما، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خوێ بە خوێ، وەك یەك، دەست بە دەست، هەر کەسێك لەوە زیاتری وەرگرت، یان داوای زیاتری کرد، ئەوە سوو خۆرە، مەگەر جۆرەکانیان جیاوازبن.**

**١٠٩-** {عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ: هُمْ سَوَاءٌ»}[٣].

**واتە: جابر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی کە سوو دەخوات، ئەو کەسەش دەیدات، وە ئەو کەسەش کە گرێبەستەکە**

---

(١) أخرجه الحَاكِم: ٢٣٠٧، وقال الحاكم: «صحيح الإسناد «، ووافقه الذهبي، انظر: «إرواء الغليل» ج٥، ص١٨٩، الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت، الطبعة: الثانية: ١٤٠٥ -١٩٨٥، عدد الأجزاء: ٨.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٤١٥٠.

(٣) أخرجه مُسْلِم: ٤١٧٧.

**دەنووسێ و، ئەو کەسەی شایەتی بۆ دەدات، وە فەرمووی: هەموویان وەك یەکن.**

## دەربارەی: قەرزو قەرزاری

١١٠- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ قَرْضٍ صَدَقَةٌ»}[١].

**واتە: ئیبنو مەسعوود ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو قەرزێك خێرە (ئەگەر بۆ کاری چاك بێت).**

١١١- {عَنْ صُهَيْبٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ تَدَيَّنَ دَيْنًا، وَهُوَ مُجْمِعٌ أَنْ لا يُوَفِّيَهُ إِيَّاهُ، لَقِيَ اللَّهَ سَارِقًا»}[٢].

**واتە: سوهەیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك قەرزێك بکات و مەبەستی ئەوەبێ قەرزەکە نەداتەوە، وەك دزێك دەگاتەوە بە خوا (واتە: لێ پرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ وەك دزێك).**

١١٢- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) أَنَّهَا كَانَتْ تَدَّانُ فَقِيلَ لَهَا مَا لَكِ وَلِلدَّيْنِ فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ كَانَتْ لَهُ نِيَّةٌ فِي أَدَاءِ دَيْنِهِ، إِلَّا كَانَ لَهُ مِنْ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَوْنٌ»، فَأَنَا أَلْتَمِسُ ذَلِكَ الْعَوْنَ}[٣].

**واتە: لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕنەوە: کە قەرزی دەکرد، پێی گوترا: چیت داوە بە قەرز کردن (بۆچی زۆر قەرز دەکەی)؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەك (قەرزێکی کردو) مەبەست و نیازی وابوو قەرزەکەی بداتەوە، ئەوە حەتمەن لەلایەن خوا**

---

(١) أخرجه البَيْهَقِي في «شعب»: ٣٥٦٣، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٨٩٩.

(٢) أخرجه ابْنُ مَاجَه: ٢٤١٠، قَالَ البوصيري: هَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٨٩٩.

(٣) أخرجه أَحْمَد: ٢٥٠٣٧، انظر: «صحيح الجامع»: ٥٧٣٤.

**(عَزَّ وَجَلَّ) یارمەتی دەدرێ (بۆ دانەوەی قەرزەکەی)، (دایکمان عائیشە دەڵێ:) من بە دوای ئەم یارمەتیەی خوا دەگەڕێم (حەز دەکەم هەردەم خوا لەگەڵم بێت بۆ یارمەتی دان).**

١١٣- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ يَتَقَاضَاهُ فَأَغْلَظَ فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعُوهُ، فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً ثُمَّ قَالَ: أَعْطُوهُ سِنّاً مِثْلَ سِنِّهِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ، فَقَالَ: أَعْطُوهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً»}[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای قەرزەکەی لێکرد (پێغەمبەر ﷺ وشترێك قەرزداری ئەو پیاوە بووە)، زۆر پێداگیری کرد (لەسەر پێغەمبەر ﷺ)، هاوەڵان ویستیان ئازاری بدەن (بە هۆی ناشیرین ڕەفتارکردن لەگەڵ پێغەمبەر)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: وازی لێ بێنن! بەڕاستی بۆ خاوەن ماف هەیە مافی قسەکردن و پێداگیری کردن، پاشان فەرمووی: وشترێکی پێ بدەن لە هەمان تەمەنی وشترەکەی خۆی، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (دەستمان نەکەوت) تەنها وشترێك کە لە هی خۆی گەورەتر بوو (چاکتر بوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێی بدەن، بە ڕاستی لە باشترین کەسەکانتان ئەوانەن کە بە چاکی قەرزەکانیان دەدەنەوە.**

١١٤- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَسْلَفَهُ مَالاً بِضْعَةَ عَشَرَ أَلْفاً فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ قَدِمَ عَلَيْهِ مَالٌ فَقَالَ: «ادْعُ لِي ابْنَ أَبِي رَبِيعَةَ»، فَقَالَ لَهُ: «خُذْ مَا أَسْلَفْتَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي مَالِكَ، وَوَلَدِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْحَمْدُ وَالْوَفَاءُ»}[٢].

---

**(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢١٨٣، وَمُسْلِم: ٤١٩٤.**

**(٢) أخرجه البَيْهَقِي في «الكبرى»: ٤٦٨٣، انظر: «صحيح الجامع» رقم: ٢٣٥٣.**

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعه ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دە هەزار زیاتری لێ بە قەرز وەرگرتم، جا کاتێ لە ڕۆژی حونەین گەڕایەوە سەروەت و سامانی بۆ هات و فەرمووی: کوڕی ئەبو ڕەبیعەم بۆ بانگ بکەن، جا پێی فەرموو: بیگرە ئەوەی بە قەرزتدا، خوا بەرەکەت بخاتە خۆت و ماڵ و منداڵت، پاداشتی قەرزدان بریتیە لە سوپاس کردن و دانەوەی قەرزەکە.**

**١١٥-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِه عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِه مِنْ غَيْرِه»}[١].

**واته: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك هەمان ماڵی خۆی بدۆزێتەوە لە لای کەسی موفلیس (کە پێشتر قەرزاری بووە)، ئەوە ئەو کەسە لە پێشترە لە کەسی دی (بەوەی داوای ماڵەکەی خۆی بکاتەوەو شتەکەی بباتەوە)[٢].**

**١١٦-** {عَنْ أَبِي الْيَسَرِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُظِلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، فَلْيَنْظِرْ مُعْسِراً، أَوْ لِيَضَعْ لَهُ»}[٣].

**واته: ئەبو یەسەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات خوا بیخاتە ژێر سێبەری (عەرشی خۆی لە ڕۆژی دوایی)، با چاوەڕوانی قەرزارێکی تەنگ دەست بکات (کە ناتوانێ قەرزەکەی بداتەوە لە کاتی دیاریکراو)، یاخود هەر لێی خۆشبێ و لێی وەرنەگرێتەوە.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢٤٠٢، وَمُسْلِم: ١٥٥٩.

(٢) پێم وایە لە کاتێکی وەك ئێستا کە دائیرەی تایبەت بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم کێشانە هەیە، دەبێ ئەم دائیرە بەم کارە هەڵبستێ، ئەگەرنا فەوزا دروست دەبێت، وەك پێشەوا قورتوبی لە تەفسیرەکەی «الجامع لأحكام القُرْآن»: ج ٢، ص ٢١٨، باسی کردوە.

(٣) أخرجه ابْنُ مَاجَهْ: ٢٤١٩، انظر: «صحيح إبن ماجه»: ١٩٦٣.

## دەربارەی: کارو کەسابەت

**١١٧-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَطْيَبُ الكَسْبِ عَمَلُ الرَّجُلِ بِيَدِهِ»}[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاکترین و چاکترین دەستکەوت و سامانـی مرۆڤ بەرهەمی دەستی خۆیەتـی.**

**١١٨-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْطوا الأَجِيرَ أَجْرَهُ، قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ»}[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقی وشك بێتەوە.**

**١١٩-** {عَنْ كُلَيْبٍ الْجَرْمِيِّ ﷺ، أَنَّهُ شَهِدَ مَعَ أَبِيهِ جَنَازَةً شَهِدَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، (قَالَ:) وَأَنَا غُلَامٌ أَعْقِلُ وَأَفْهَمُ، فَانْتَهَى بِالْجَنَازَةِ إِلَى الْقَبْرِ وَلَمْ يُمْكِنْ لَهَا، قَالَ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَوُّوا لَحْدَ هَذَا»، حَتَّى ظَنَّ النَّاسُ أَنَّهُ سُنَّةٌ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّ هَذَا لَا يَنْفَعُ الْمَيِّتَ وَلَا يَضُرُّهُ، وَلَكِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ مِنَ الْعَامِلِ إِذَا عَمِلَ أَنْ يُحْسِنَ»}[3].

**واتە: کولەیبی جەرمی ﷺ دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ باوکی ئامادەی ناشتنی جەنازەیەك بوون کە پێغەمبەری خواش ﷺ لەوێ ئامادەبوو، (کولەیب دەڵێ): لە کاتێکدا من منداڵێك بووم عەقڵم بەشتەکان دەشکاو**

---

**(١) أخرجه أَحْمَد: ١٧٣٠٤، والحاكم عن رافع بن خديج والطبراني، انظر: «الصحيحة» رقم: ٦٠٧.**

**(٢) أخرجه اِبْنُ مَاجَه: ٢٤٤٣، انظر: «صحيح إبن ماجه» رقم: ١٩٨٠.**

**(٣) أخرجه الطَّبَرَانِي: ٤٩٢٣، انظر: «صحيح الجامع»: ٨٠٣٧.**

تێدەگەیشتم، جەنازەکەیان هێنا لای گۆڕەکە، لە کاتێکدا هێشتا ئامادە نەبوو، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەر دەیفەرموو: گۆڕەکەی ڕاست و ڕێك بکەن، تا خەڵك وایان زانی ئەمە سوننەتە، جا ئاوڕی بۆ دانەوەو فەرمووی: ئەمە هیچ سوود ناگەیەنێ بە مردوو، وە هیچ زیانێکیشی پێ ناگەیەنێ، بەڵام خوا ئەو کرێکارو فەرمانبەرەی خۆش دەوێ کە کارەکەی بە جوانی دەکات.

١٢٠- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّه يُحبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ»}[١]

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا حەز دەکات ئەگەر یەکێك لە ئێوە کارێکی ئەنجامدا بە وردەکاریی و بە پوختی و ڕێکی ئەنجامی بدات.

١٢١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسێك کە تۆی بە ئەمیندار داناوە، سپاردەکەی بدەوە، وە خیانەت لە کەسێك مەکە کە خیانەتی لە تۆ کردوە.

تێبینی: ئێمە وەك مسوڵمان کە سپاردەیەکمان لە لای کەسێك داناوە، ئەو بزری کردوە، ئەگەر بەیانی ئەویش سپاردەیەکی لە لای ئێمە دانا، نابێ ئەمانەتەکەی ون بکەین بە ئەنقەست، بڵێین: تۆڵە بە تۆڵە! ئەگەر ئەو ئەمانەتی کەسێکی مسوڵمانی ون کردوە، ئەو کەسە بۆی هەیە لە ڕێی شەرعییەوە، لە ڕێی یاساوە دەعوای لەسەر تۆمار بکات و هەقی

---

(١) أخرجه البَيْهَقِي في «الشعب»: ٥٣١٢، ، انظر: «الصحيحة»: ١١١٣.

(٢) أخرجه الحَاكِمُ: ٢٢٩٦، وَقَالَ: صَحِيح عَلَىَ شَرْطِ مُسْلِم، انظر: «الصحيحة»: ٤٢٣.

خۆی وەربگرێتەوە، بەڵام خیانەتی لێ بکاتەوە، بڵێ: بۆچی ئەو خیانەتی لێکردووم، کە ڕەنگە هەر خیانەتیش نەبێت و بە مەبەستیش وای نەکردبێ، بەڵام گریمان زانیمان خیانەتی کردوەو فەوتاندوویەتی، ئەگەر ئەو خیانەت لە خۆی دەوەشێنێتەوە ئەو مسوڵمانە نابێ ئەو کارە ناشرینە لە خۆی بوەشێنێتەوە، بەڵکو دەبێ ئەو هەقەی خۆی بە شێوەیەکی دیکە وەربگرێتەوە.

## دەربارەی: خەڵات و دیاری

١٢٢- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»}[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە دیاری و خەڵاتێك کە داویەتی بە کەسێك پەشیمان دەبێتەوە، وەك سەگێك وایە کە بڕشێتەوە، دوایی ڕشانەوەکەی خۆی بخواتەوە.

١٢٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «تَهَادُوا تَحَابُّوا»}[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دیاری بدەن بە یەکدی، خۆشەویست دەبن لە لای یەکدی.

١٢٤- {عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ رِزْقاً، فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ غُلُولٌ»}[٣].

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٢٤٤٩، وَمُسْلِم: ٤٢٦١.
(٢) أخرجه اَلْبُخَارِيُّ فِي «اَلْأَدَبِ اَلْمُفْرَدِ»: ٥٩٤، انظر: «صَحِيح اَلْأَدَب اَلْمُفْرَد»: ٤٦٣.
(٣) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٢٩٤٥، انظر: «صحيح الجامع»: ٦٠٢٣.

واتە: بورەیدەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێکمان دانا لەسەر کارێك و هەقێك و (معاشێکمان) پێدا، جگە لەوەی پێمان داوە هەرچی دیکە وەری بگرێ (وەك دیاری) ئەوە ناپاکیی و دزیە لە موڵکی گشتی.

١٢٥- {عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَدَايَا الْعُمَّالِ غُلُولٌ»}[١].

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دیاری وەرگرتنی کارمەندو فەرمانبەران دزیی و ناپاکییە.

تێبینی: ئەم دیاری پێدانە دروست نیە، مادام لە بەرانبەر کارێکی ناشایستە بێ، وەك: نۆرەو سرە پێش خستن، مافی کەسی دی خواردن، یان مافی گشتی خواردن، جا بە ناوی بەرتیل و ڕشوە بێ، یان هەر ناوێکی دی، بێگومان ئەمە حەرامەو هەردووکیان گوناهبار دەبن، وەك لەم فەرموودانەی دواتر باس دەکرێن، چونکە ئەگەر ئەو کەسە فەرمانبەرو کاربەدەست نەبووایە ڕەنگە ئەم دیاریەی بۆ نەهاتبا، جا مەرجیش نیە کارێکی کردبێ پاشان دیاری بۆ بێ، کەسی وا هەیە هێندە نالەبارە، دێ پێش ئەوەی کارەکە بە فەرمانبەرەکە بکات، دیاری پێ دەدات، بۆ ئەوەی ناچاری بکات لە کاتی پێویست کاری نادروستی بۆ بکات، لە هاوەڵی نزیکی خۆم بیستوە، پارێزەری وا هەبووە، سی مسقاڵ زێڕی بە دیاری داوە بە فەرمانبەر!!

١٢٦- {عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَرْجِعُ أَحَدٌ فِي هِبَتِهِ إِلَّا وَالِدٌ مِنْ وَلَدِهِ، وَالْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»}[٢].

---

(١) أخرجه أحْمَد: ٢٣٦٤٩، انظر: إرواء الغليل: ٢٤٦/٨.
(٢) أخرجه النَّسَائِي: ٣٦٨٩، انظر: «صحيح الجامع»: ٧٦٨٦.

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە باوکی، ئەویش لە باپیری ﷺ کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەس بۆی نیە دوای ئەوەی شتێکی کردە دیاری لێی پەشێمان ببێتەوە، تەنها باوك نەبێت بەرانبەر بە منالەکەی، وە ئەو کەسەی کە لە دیاریەکەی پەشیمان دەبێتەوە (جگە لە باوك) وەك ئەو کەسە وایە کە بگەڕێتەوە بۆ ڕشانەوەکەی خۆی و بیخواتەوە.

تێبینی: واتە: ئەگەر باوك شتێکی دا منداڵی خۆی دوایی پەشێمان بۆوە، گوناهبار نابێت، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەم منداڵ و، هەم ماڵی منداڵیشی بە هی باوکەکە داناوە، کەواتە: وەك ئەوە وایە شتێکی بە خۆی بەخشی بێت و دوایی پەشێمان بووبێتەوە، دەفەرموێ: «إِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ، فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلَادِكُمْ»[1]، واتە: منداڵەکانتان لە بەدەست هێنراوی پاك و چاکی ئێوەن، بۆیە لە ماڵ و سامانی منداڵەکانتان بخۆن.

## دەربارەی: خواردن و خواردنەوەکان

١٢٧- {عَنْ وَحْشِيِّ بْنِ حَرْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَأْكُلُ وَلَا نَشْبَعُ، قَالَ: «فَلَعَلَّكُمْ تَأْكُلُونَ مُتَفَرِّقِينَ؟»، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ»}[2].

واتە: وەحشی کوڕی حەرب ﷺ دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمەری خوا ﷺ! ئێمە نان دەخۆین و تێریش نابین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەوانەیە بەجیا نان بخۆن (تاك تاك)؟! گوتیان بەڵێ، فەرمووی:

---

(١) أخرجه أبُو دَاوُدَ: ٣٥٢٨، انظر: «صحيح الجامع»: ١٤٨٧.

(٢) أخرجه أبو داود: ٣٧٦٤، وابن ماجه: ٣٢٨٦، انظر الصَّحِيحَة: ٦٦٤، وصَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيب: ٢١٢٨.

لەسەر نان خواردن کۆببنەوە، وە ناوی خوای لەسەر بێنن، بۆ ئەوەی خوا بەرەکەت و پێزی تێبخات.

١٢٨- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامَاً، فَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ، حَتَّى يَلْعَقَهَا»}[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی خوارد با دەستی نەسڕێتەوە هەتا دەیلێستەوە.

١٢٩- {عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَهُوَ ابْنُ صُهَيْبٍ، قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ ﷺ عَنِ الثُّومِ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ مَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، فَلَا يَقْرَبَنَّا، وَلَا يُصَلِّي مَعَنَا»}[٢].

واتە: عەبدولعەزیز کە کوڕی سوهەیبە دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەنەس ﷺ دەربارەی سیر، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لەو درەختە (واتە: سیرو پیاز) بخوات، با لێمان نزیك نەبێتەوە، وە نوێژمان لەگەڵ نەکات.

١٣٠- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللّهِ تَعَالَى، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللّهِ تَعَالَى فِي أَوَّلِهِ، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ»}[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە (شتێکی) خوارد با ناوی خوای بەرز بێنێ، ئەگەر لە بیری چوو لە سەرەتا ناوی خوای بەرز بێنێ، با بڵێ: (بسم اللّه) لە سەرەتاو کۆتایی دا.

---

(١) أخرجه البُخَارِيُ: ٥٤٥٦، وَمُسْلِم: ٢٠٣١.

(٢) أخرجه البُخَارِي: ٨١٨، ومسلم: ٥٦٢.

(٣) أخرجه أَبُو دَاوُدَ: ٣٧٦٩ انظر: «صحيح إبن ماجه»: ٣٢٦٤.

**۱۳۱-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ الطَّعَامُ، فَلاَ تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهِ، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ تَنْزِلُ وَسَطَهُ، وَكُلُوا مِنْ حَافَتَيْهِ أَوْ حَافَتَيْهَا»}[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خواردن دانرا، لە نێوەڕاستەکەی مەخۆن، چونکە بە دڵنیایی بەرەکەت دەکەوێتە نێوەڕاستەکەی، لە دەوروبەرو لێواری (خواردنەکە دەست پێبکەن و) بخۆن.**

**۱۳۲-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ أَبِي قتادةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ، وَإِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَمْسَحْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا تَمَسَّحَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ»}[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە پەرداخێك (خواردنەوەیەکی) خواردەوە با هەناسەی تێدا نەدات (واتە: فووی تێنەکات و نەفەسی تێدا نەداتەوە)، وە ئەگەر یەکێك لە ئێوە میزی کرد با دەستی ڕاستی لە زەکەری (عەورەتی) نەدات، وە ئەگەر یەکێك لە ئێوە خۆی پاك کردەوە لە پیسایی، با بەدەستی ڕاستی خۆی پاك نەکاتەوە.**

**۱۳۳-** {عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَاقِي القَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبَاً»}[3].

**واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ئاو دەگێڕێ و ئاو دەداتە خەڵك، با بە خۆی کۆتا کەس بێ ئاو بخواتەوە، (وەك ئەدەبێکی ڕێز گرتن لە میوان).**

---

**(۱) أخرجه أَحْمَد: ٣٤٣٨، قال شعيب الأرنؤوط: حَسَن.**
**(۲) أخرجه البُخَارِي: ١٥٣، وَمُسْلِم: ٢٦٧.**
**(۳) أخرجه مُسْلِم: ١٥٩٤.**

**١٣٤-** {عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَكَلَ طَعَامًا، فَقَالَ: الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»}[١].

**واتە: موعازی کوڕی ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس شتێکی خواردو گوتی: (الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ) واتە: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەو خۆراکەی پێ بەخشیم و کردی بە ڕۆزی بۆم، بێ ئەوەی زیرەکی و هێزی خۆمی تێدابێ "گشتی خوا بە فەزڵی خۆی بەخشیویەتی") ئەوە خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش بووە.**

**١٣٥-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلطَّاعِمِ الشَّاكِرِ مِنَ الأَجْرِ، مِثْلُ مَا لِلصَّائِمِ الصَّابِرِ»}[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی کەسێك کە نان دەخواو سوپاسگوزاری خوای لەسەر دەکات، هەمان پاداشتی ڕۆژووەوانێکی ئارامگری بۆ هەیە.**

## دەربارەی: ئـــافرەتـــان

**١٣٦-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنْكِحُوا فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ»}[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوسەرگیری بکەن (تا منداڵی مسوڵمانان زۆر بن لەسەر پەروەردەی**

---

(١) أخرجه التِّرمِذِي: ٣٤٥٨، انظر: «صحيح التِّرمِذِي»: ٢٧٥١.
(٢) أخرجه الحَاكِمُ: ٧١٩٥، انظر: «صحيح الجامع»: ٢١٧٩.
(٣) أخرجه إبْنُ مَاجَهْ: ١٨٦٣، انظر: «صحيح الجامع»: ١٥١٤.

**ئیسلامی)، چونکە بە دڵنیایی من شانازیی بە زۆری (ژمارەتان) دەکەم (لە ڕۆژی قیامەت).**

١٣٧- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ؛ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»}(١).

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەر کەس لە توانای دا هەیە با هاوسەگیری بکات، چونکە ئەمە هۆکاری چاو داخستن و چاوتێری و پاراستنی داوێنیەتی، وە هەر کەسیش لە توانای دا نیە (هاوسەرگیری بکات) ئەوە با ڕۆژوو بگرێ، کە ئەمە دەبێتە پەرژین بۆی و ئارەزووی کەم دەکاتەوە.**

١٣٨- {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «حُبِّبَ إِلَيَّ النِّسَاءُ، وَالطِّيبُ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ» }(٢).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە دونیادا ئافرەتان و بۆنی خۆشم لەلا خۆشەویستن، وە ڕۆشنایی چاوانم لە نوێژ کردن دایە.**

١٣٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَوْنُهُمْ: الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ، وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ»}(٣).

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس مافیان هەیە لەسەر خوا کە هاوکاریان بکات: ئەو کەسەی لە پێناوی خوا**

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٤٧٧٩.
(٢) أخرجه أَحْمَد: ١٢٣١٥، وَحَسَّنَهُ شعيب الأرنؤوط.
(٣) أخرجه التِّرْمِذِيُّ: ١٦٥٥، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ١٩١٧.

**دەجەنگی، ئەو کۆیلەیەی دەیەوێ پارە بدات و خۆی ئازاد بکات، ئەو کەسەش هاوسەرگیری دەکات نیەتی داوێن پاکییە.**

**١٤٠-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێ: لەبەر ماڵ و دارایی، لەبەر بنەماڵەو ڕەچەڵەکی، لەبەر جوانی، لەبەر ئاینی، جا دەست بگرە بە خاوەن ئاینەوە، (ئەگەر وانەکەیت) دەست کورت دەبیت و هەژار دەکەویت (لە گشت خێرو بێرێکی ئافرەتی چاك).**

**١٤١-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو خێزانی هەبن و، بەلای یەکێکیاندا بشکێتەوە (ماف و گرنگی زیاتری پێبدات)، ئەوە ڕۆژی دوایی بە لارو خواری دێت.**

**١٤٢-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لا تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَكَيْفَ إِذْنُهَا قَالَ: «أَنْ تَسْكُتَ»}[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن مارە نابڕدرێ تا قسەو فەرمانی لێ وەرنەگیرێ، وە کچیش مارە نابڕدرێ تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەت وەرگرتنی کچ چۆنە؟ فەرمووی: بێدەنگ بوونیەتی.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٤٨٠٢، وَمُسْلِم: ١٤٦٦.

(٢) أخرجه إبن حبان: ٤٢٠٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرطهما.

(٣) أخرجه البُخَارِيّ: ٦٥٦٩.

**١٤٣-** {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ، فَقَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا»}[1].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێ بۆ لای هاوسەرەکەی ئەوە با بڵێ:** (بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا) **واتە: بە ناوی خوا، خوایە شەیتانمان لێ دووربخەوە، وە شەیتانیش دووربخەوە لەو ڕزقەی پێت داوین (کە منداڵە).**

**١٤٤-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا»؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَاذْهَبْ، فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الأَنْصَارِ شَيْئًا»}[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە لای پێغەمبەر ﷺ بووم، پیاوێك هاتە لای و هەواڵی پێدا کە ئافرەتێکی ئەنصاریی خواستوە (داوای کردوە بۆ خوازبێنی)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا تەماشات کردوە؟ گوتی: نەخێر نەمبینیوە، فەرمووی: بڕۆ تەماشای بکە، چونکە لە چاوی ئەنصارییەکان شتێك هەیە!**

**(قَالَ النَّوَوِيّ: قِيلَ: الْمُرَاد صِغَر، وَقِيلَ زُرْقَة)[3] واتە: پێشەوا نەوەوی دەڵێ: دەڵێن: مەبەست ئەوەیە چاویان بچووکە، وە دەشڵێن: مەبەست ئەوە بووە کە چاویان شین بووە.**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٦٩٦١.

(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ٤٨٤٨.

(٣) المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، المؤلف: أبو زكريا يحيى بن شرف بن مري النووي، الناشر: دار إحياء التراث العربي، بيروت، الطبعة الثانية: ١٣٩٢. ج١٠، ص٢١٠.

## دەربارەی: هاوسەنگی لە دینداریی

١٤٥- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»}[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پشت بکاتە ڕێبازی من، لە من نیە (واتە: لەم کردەوەدا لە ڕێی من لایداوە، نەك ئیتر لە بازنەی ئیسلام چووبێتە دەرو مسوڵمان نەمابێ، ئەگەر بابەتەکە عەقیدەیی نەبێت).**

**تێبینی: ئەنەس ﷺ دەڵێ: سێ کەس هاتن بۆ لای ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، پرسیاریان کرد دەربارەی خواپەرستی پێغەمبەر ﷺ؟ کاتێك هەواڵیان پێدرا، بە کەمیان زانی، دوایی گوتیان: جا ئێمە لە کوێ و پێغەمبەر ﷺ لە کوێ؟! خوا لە گوناهی پێشێ و دوایی خۆش بووە.**

**یەکێکیان گوتی: من هەمیشە شەونوێژ دەکەم، (واتە: شەو ناخەوم).**

**ئەوی دیکەشیان گوتی: منیش هەموو ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبم.**

**ئەوی دیکەشیان گوتی: منیش دووریی لە ئافرەتان دەکەم و هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ کە گەڕایەوە بۆ ماڵ، هەواڵیان پێدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئێوە بوون کە ئاواو ئاواتان گوتوە؟ دوایی فەرمووی: ئاگاداربن! بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە خوا دەترسێم و لە هەمووشتان زیاتر پارێزی لێدەکەم، بەڵام بە ڕۆژوو دەبم، (واتە: ڕۆژووی سوننەت) جاری واش هەیە بەڕۆژووش نابم، وە شەوان نوێژیش دەکەم، وە دەشخەوم،**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٤٧٧٦، وَمُسْلِم: ١٤٠١.

**(واتە: پشوو دەدەم)، وە هاوسەرگیریش دەکەم لەگەڵ ئافرەتان، هەر کەس لە ڕێبازی من لابدات، لە من نیە.**

١٤٦- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ»}[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! خۆتان لە تێپەڕاندن لە دینداریيدا بپارێزن (بەوەی هاوسەنگی ژیان و مافەکان تێك بدەن بە هۆی عیبادەتی زۆرەوە)، ئەوانەی پێش ئێوە بە هۆی تێپەڕاندنەوە لە دینداریی دا فەوتان.**

**تێبینی:[٢] ئەو بەرنامەو دینەی خوا دەینێرێ ئینسان هاوسەنگ دەکات، هەقی ڕووح، هەقی جەستە، هەقی عەقڵ، هەقی عاتیفە، هەقی تاك، هەقی خێزان، هەقی کۆمەڵ، هەقی دنیا، هەقی قیامەت، هەقی خوای پەروەردگار، هەموو هەقەکان دەدات، وەك لەم فەرمایشتە چەند مافێك باسکراوە:** {عَنْ عَبْدَ اللّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، يَقُولُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ؟»، قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: «فَلاَ تَفْعَلْ، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ عَيْنَاكَ، وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، إِنَّ لِعَيْنِكَ حَقٌّ، وَلِنَفْسِكَ حَقٌّ، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقٌّ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ»}[٣].

**دین ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێك و ڕاست بگیرێ ئینسان هاوسەنگ دەکات، بەڵام کاتێك تێیدەپەڕێنی بەسەر لایەکی دیکە، وەختێك کە ئینسان لەلایەك تێدەپەڕێنێ لەسەر حیسابی بە زایەدانی لایەکی دیکەیە، جا ئەگەر لایەنی عیبادەت تێپەڕێنێ دیارە لەسەر حیسابی دیکەیە، وە ئەگەر لەلایەنی**

---

(١) أخرجه إبْنُ مَاجَه: ٣٠٢٩، وَالنَّسائِي: ٣٠٥٧، انظر: «صحيح إبن ماجه» رقم: ٣٠٢٩.
(٢) تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز، سوورەتی (النساء)، ئایەتەکانی (١٧٠ - ١٧٦).
(٣) أخرجه أحْمَد: ٥٦٣٧، وَصَحَّحَهُ شُعيب الأرنؤوط.

زوهد تێپەڕێنی دیارە لەسەر حیسابی لایەکی دیکەیە، لایەنی جەنگ و جیهاد تێپەڕێنی دیارە لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکەیە ... هتد، بەڵام ئەگەر هەمووی بە هاوسەنگی بگیرێ دیارە بە هیچ لایاندا لاسەنگ نابی.

١٤٧- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلَا هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ. أَلَا هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ. أَلَا هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ»}(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاگاداربن! فەوتان ئەوانەی توندن، فەوتان ئەوانەی توندن، فەوتان ئەوانەی توندن (و سەختگیری دەکەن لە دینداریی).

١٤٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ: هَلَكَ النَّاسُ فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ، (أو أَهْلَكَهُمْ)»}(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك گوتی: خەڵك هەموو لە ناوچوون و خراپ بوون، ئەوە ئەو لە هەموو خەڵکی لە ناوچووترە، یاخود (بەو بۆچونە سەقەتە و بڵاوکردنەوەی ئەو بۆچونە توندەی) خەڵکی بە هیلاك داوە! (چونکە بۆچونی بەرانبەر خەڵکی توندە و خەڵکی لە دین دەڕەوێنێتەوە).

تێبینی: لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە کابرا زۆر بە خۆی سەرسام و موعجیبە، خۆی پێ لە خەڵك گرنگترو گەورەترە، وە بە چاوێکی کەم سەیری خەڵك دەکات، بێگومان ئەمە حەڕامە، بەڵام ئەگەر کەسێك وا بڵێ مەبەستی ئەوە بێ خەڵك لە دینداری زۆر خراپ بوون، وە ئەویش لەبەر ئەمە وا بڵێ کە دڵی بەوە نارەحەتە کە خەڵك لەو حاڵە خراپەدان، وە مەبەستی بە سووك باس کردنیان نەبێ، بەڵکو وەك خەمخۆریی بێ دروستە.

---

(١) أخرجه أحمد: ٣٥٦٦، ومُسْلِم: ٢٦٧٠ ، وَأَبُو دَاوُدَ: ٤٦٠٨.
(٢) أخرجه مُسْلِم: ٢٦٢٣، قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: لاَ أَدْرِي، أَهْلَكَهُمْ بِالنَّصْبِ، أَوْ أَهْلَكُهُمْ بِالرَّفْعِ.

## دەربارەی: مەسرەف کێشانی ماڵ و منداڵ

١٤٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللّهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْرًا الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینارێك کە خەرجی دەکەی لە پێناوی خوا، وە دینارێك کە خەرجی دەکەی بۆ ئازاد کردنی کۆیلەیەك، وە دینارێك کە دەیکەیە خێرو دەیبەخشی بە نەدارێك، وە دینارێك کە خەرجی دەکەی بۆ خێزان و منداڵەکانت، ئەوەی کە پاداشتەکەی گەورەترینە بریتیە لەوەی کە بۆ خێزان و منداڵەکانت خەرجت کردوە.**

١٥٠- {عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا سَقَى امْرَأَتَهُ مِنْ الْمَاءِ أُجِرَ»، فَأَتَيْتُ امْرَأَتِي فَسَقَيْتُهَا ، وَحَدَّثْتُهَا بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللّهِ ﷺ}[2].

**واتە: عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر پیاو ئاو بداتە خێزانەکەی (ئەوە لەسەر ئەو ئاو پێدانە) پاداشتی دەدرێتەوە، (عیرباز دەڵێ:) چوومەوە لای خێزانم ئاوم پێدا، وە ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێ بوو، بۆم باس کرد.**

١٥١- {عَنْ طَارِقٍ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ، قَالَ: قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ النَّاسَ وَهُوَ يَقُولُ: «يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ: أُمَّكَ، وَأَبَاكَ، وَأُخْتَكَ، وَأَخَاكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ، أَدْنَاكَ»}[3].

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٩٩٥.

(٢) أخرجه أَحْمَد: ١٧١٩٥، قَالَ شعيب الأرنؤوط: صحيح بِشَوَاهِدِهِ.

(٣) أخرجه ابْنُ حِبَّان: ٣٣٣٠، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

**واتە: تاریقی موحاریبی ﷺ دەڵێ: گەیشتینە مەدینە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر وەستا بوو، وتاری بۆ خەڵك دەداو، دەیفەرموو: ئەو دەستەی کە دەبەخشێ بەرزە، وە (لە خێر کردن) لەوانەوە دەست پێبکە کە سەرپەرشتی کردنیان لە ئەستۆتە، دایك و باوکت، وە خوشك و برات، پاشان نیزیکترو نیزیکتر لێت (لە خزمەکانت).**

**١٥٢-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَعَامُ الإِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاَثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواردنی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکات، وە خواردنی سێ کەس بەشی چوار کەس دەکات.**

**١٥٣-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا غَيرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا، وَلَهُ مِثْلُهُ بِمَا اكْتَسَبَ، وَلَها بِمَا أَنْفَقَتْ»}[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت لە ماڵ و سامانی مێردەکەی مەسرەف بکات و (بەشێکی لێ بکاتە خێر)، بێ ئەوەی زێدەڕۆیی تێدا بکات ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، هەروەها پاداشت بۆ مێردەکەشی دەنووسرێ.**

**١٥٤-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ»، وَضَمَّ أَصَابِعَهُ}[3].

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ٥٣٩٢، وَمُسْلِم: ١٧٨، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة ﷺ.
(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ١٣٥٩، وَمُسْلِمٌ: ١٠٢٤، وَاللَّفظُ لِمُسْلِم.
(٣) أخرجه مَسْلِم: ٦٨٦٤.

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو کچۆڵە بە خێو بکات هەتا باڵغ دەبن، لە ڕۆژی قیامەت کە دێت من و ئەو ئاواین، (پەنجەکانی هێنا تەنیشت یەك)!**

**١٥٥-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلَاثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلَاثَ أَخَواتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ»}[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نیە لە ئۆممەتی من سێ کچ، یان سێ خوشك بە خێو بکات، وە چاکەکاربێ لەگەڵیان، ئەوە بە دڵنیایی بۆی دەبنە پەرچ و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.**

## دەربارەی: چاکەکاریی لەگەڵ دراوسێ

**١٥٦-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»}[٢].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم و ڕایدەسپاردم بە باشبوونم لەگەڵ دراوسێ، هەتا وا گومانم برد کە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ!!**

**١٥٧-** {عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: «خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللّٰهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيْرَانِ عِنْدَ اللّٰهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ»}[٣].

---

(١) أخرجه البَيْهَقِيُّ في «شعب»: ١١٠٢٣، انظر: «صحيح الجامع»: ٥٣٧٢.

(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ٥٦٦٩، وَمُسْلِم: ٦٨٥٢.

(٣) أخرجه إبن حبّان: ٥١٨، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین برادەر لە لای خوا ئەو برادەرەیە کە زۆر باشبێ بۆ برادەری خۆی، وە باشترین دراوسێ لە لای خوا ئەو دراوسێیەیە کە بۆ دراوسێیەکەی زۆر باشبێ.**

**١٥٨-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا): أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: «إِنَّهُ مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ، وَحُسْنُ الْخُلُقِ، وَحُسْنُ الْجِوَارِ، يَعْمُرَانِ الدِّيَارَ، وَيَزِيدَانِ فِي الأَعْمَارِ»}[١].

**واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هەر کەسێك بەشێکی لە نەرم و نیانی پێدرابێ ئەوە بە دڵنیایی بەشی خۆی لە چاکە پێبەخشراوە لە دنیاو دوارۆژدا، وە پەیوەندی خزمایەتی و ڕەوشت جوانی و باشبوون لەگەڵ دراوسێ، وڵات ئاوەدان دەکەنەوەو تەمەنەکانیش درێژ دەکەن.**

**١٥٩-** {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا)، قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللّهِ ﷺ! إِنَّ لِي جَارَيْنِ فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: «إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَاباً»}[٢].

**واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من دوو دراوسێم هەن، ئایا دیاری بۆ کامیان ببەم؟ فەرمووی: بۆ ئەو دراوسێیەی کە دەرگاکەی لێت نزیکترە.**

**١٦٠-** {عَنْ عَبدِ اللّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللّهِ ﷺ! مَتَى أَكُونُ مُحْسِناً؟ قَالَ: «إِذَا قَالَ جِيرَانُكَ: أَنْتَ مُحْسِنٌ، فَأَنْتَ مُحْسِنٌ، وَإِذَا قَالُوا: إِنَّكَ مُسِيءٌ، فَأَنْتَ مُسِيءٌ»}[٣].

---

(١) أخرجه أَحْمَد: ٦٥٦٦، قال شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح.

(٢) أخرجه أَحْمَد: ٢٥٢٩٨، قال شعيب الأرنؤوط: إِسنَادُهُ صَحِيح عَلَىَ شَرطِ الشَيخَين.

(٣) أخرجه ابْنُ حِبَّانَ: ٥٢٥، قَالَ شعيب الأرنؤوط: إِسنَادُهُ صَحِيح عَلىَ شَرطِ الشَيخَين.

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کەی من چاکەکار دەبم؟ (واتە: کەی بە کەسێکی چاکەکار دادەنرێم)؟ فەرمووی: ئەگەر دراوسێکانت پێیان گوتی: تۆ چاکەکاری، ئەوە تۆ چاکەکاری، وە ئەگەر گوتیان: تۆ خراپی، ئەوە تۆ خراپی.

## دەربارەی: ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان

١٦١- {عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِه، دَرَجَات قَائِمِ اللَّيلِ، صائِمِ النهارِ»}[1].

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی پیاو (یان ژن) بە هۆی ڕەوشت جوانیەوە، دەگاتە پلەو پایەی کەسێك کە بە شەوان شەو نوێژ بکات و، بە ڕۆژیش بەڕۆژوو بێ.

١٦٢- {عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «مَثَلُ المُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ، وَتَرَاحُمِهِمْ، وَتَعَاطُفِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى»}[2].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وێنەی ئیمانداران لە یەکدی خۆشویستن و بەزەیی بە یەکدی هاتنەوەیان و پەرۆشیان بۆ یەکدی وەك یەك جەستەن، کە ئەگەر ئەندامێکی ناساغ بوو، هەموو جەستەکە بە شەونخونی و تاوە بەشداری دەکات.

١٦٣- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَكْمَلِ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَإِنَّ حَسنَ الْخُلُقِ لَيَبْلُغُ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ»}[3].

---

(١) أخرجه البَيْهَقِي في «شعب»: ٧٩٩٨، انظر «صحيح الجامع»: ١٦٢٠.

(٢) أخرجه مُسْلِمٌ: ٢٥٨٦.

(٣) أخرجه البَزّار: ٧٤٤٥، والترمذي: ١١٦٢، انظر: «صحيح الجامع»: ١٥٧٨.

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو ئیمانداره ئیمانی کامڵه کە: خاوەنی جوانترین ڕەوشتە، چونکە بەڕاستی کەسی ڕەوشت جوان دەگاتە پلەی ڕۆژوگرو شەونوێژکار (مەبەست نوێژو ڕۆژووی سوننەتە).**

**١٦٤-** {عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ»}[1].

**واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی خەڵك پێی ڕاگەیشتوە لە قسەی پێغەمبەرەکانی پێشوو ئەمەیە: ئەگەر شەرمت نەکرد چی دەکەی بیکە!!**

**١٦٥-** {عَنْ أَبِي بَكْرَةَ نُفَيْعِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الْحَيَاءُ مِنْ الْإِيمَانِ، وَالْإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنْ الْجَفَاءِ، وَالْجَفَاءُ فِي النَّارِ»}[2].

**واتە: ئەبو بەکرە نەفیعی کوڕی حارس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەرمنی لە ئیمانەوەیە، وە (خاوەنی) ئیمان لە بەهەشتە، بێ شەرمی لە دڵ ڕەقیەوەیە، (خاوەنی) دڵڕەقی لە نێو ئاگرە.**

**١٦٦-** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَقَبَّلُوا لِي بِسِتٍّ أَتَقَبَّلْ لَكُمْ بِالْجَنَّةِ»، قَالُوا: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: «إِذَا حَدَّثَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَكْذِبْ، وَوَعَدَ فَلَا يُخْلِفْ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ فَلَا يَخُنْ، وَغُضُّوا أَبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيَكُمْ، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ»}[3].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێوە شەش شتم لێ وەربگرن و پێوەی پابەندبن منیش بەهەشتتان بۆ**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٥٦٥٤.

(٢) أخرجه التِّرمِذِيّ: ٢٠٠٩، انظر: «الصحيحة»: ٤٩٥.

(٣) أخرجه الحَاكِمُ: ٨٠٦٧، والبيهقي في شعب الإيمان: ٤٣٥٥، انظر: «صحيح الجامع»: ٢٩٧٨.

وەردەگرم، گوتیان: ئەو شتانە چین؟ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان قسەی کرد با درۆ نەکات، وە ئەگەر بەڵێنیدا نەیشکێنێ، وە ئەگەر ئەمانەتی پێ سپێردرا ناپاکی تێدا نەکات، وە چاوتان لابدەن (لە سەیر کردنی حەرام وەك: تەماشاکردنی شتی حەرام)، وە دەستان بگرنەوەو (لە هەر شتێکی خراپ)، وە داوێنتان بپارێزن و پاکی ڕابگرن.

١٦٧- {عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «أُخْبِرُكُمْ بِأَحَبِّكُمْ إِلَيَّ، وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟» فَسَكَتَ الْقَوْمُ، فَأَعَادَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، قَالَ الْقَوْمُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «أَحْسَنُكُمْ خُلُقًا»}[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی ئەویش لە باپیریەوە (عەمری کوڕی عاص) ﷺ دەگێڕێتەوە، کە بیستوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ کە دەیفەرموو: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویسترینتان لە لای من، وە بە نیزیکترینتان لە کۆڕو مەجلیسی من لە ڕۆژی قیامەت؟ جا خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، دووجار، یان سێ جار فەرموویەوە، خەڵکەکە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسەتان کە لە هەمووتان ڕەوشتی جوانترە.

١٦٨- {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ مَعَالِيَ الأُمُورِ، وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا»}[٢].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خوای زاڵی پایەدار کارو کردەوەی بەرزی خۆشدەوێ و، کارو کردەوە کەم و سووکەکانی خۆشناوێ.

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٢٧٢، «السلسلة الصحيحة» (٧٩٦).

(٢) أخرجه الطَّبَرَانِيُّ في «الأوسط»: ٦٩٠٦، انظر: «الصحيحة»: ١٦٢٧.

١٦٩- {عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُوا، أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا تَحَابُّونَ عَلَيْهِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تَرَاحَمُوا»، قَالُوا: كُلُّنَا رَحِيمٌ، قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ رَحْمَةُ أَحَدِكُمْ أَصْحَابَهُ، وَلَكِنَّهَا رَحْمَةُ العَامَّةِ»}[١].

**واتە: ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نابن بە ئیمانداری تەواو تاوەکو یەکترتان خۆشدەوێ، ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە خۆشەویستی نێوانتان زیاد بکات؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: سەلام لەنێوانتان بڵاو بکەنەوە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ناچنە بەهەشت تا بەزەییتان بە یەکتریدا نەیەتەوە، گوتمان: ئێمە هەمووومان بە بەزەیین، فەرمووی: ئەوەنا کە یەکێکتان بەرانبەر هاوەڵەکەی بەبەزەیی بێ، بەڵکو بەبەزەیی بوون ئەوەیە بەرانبەر هەموو کەسێك بە بەزەیی بیت.**

١٧٠- {عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا، حَتَّى لاَ يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ»}[٢].

**واتە: عیازی کوڕی حیمار ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا وەحی بۆ ناردووم کە زۆر خاکی و سادەبن و خۆ بە گەورە نەگرن، تا هیچ یەکێکتان ستەم لە یەکێکی دیکەتان نەکات، وە هیچ کەسێکتان شانازی بەسەر کەسێکی دیکەتانەوە نەکات.**

١٧١- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَصْبَحَ ابْنُ آدَمَ فَإِنَّ الأَعْضَاءَ كُلَّهَا تُكَفِّرُ اللِّسَانَ، فَتَقُولُ: اتَّقِ اللَّهَ فِينَا، فَإِنَّمَا نَحْنُ بِكَ، فَإِنِ اسْتَقَمْتَ اسْتَقَمْنَا، وَإِنْ اعْوَجَجْتَ اعْوَجَجْنَا»}[٣].

---

(١) أخرجه الحَاكِم في «المستدرك»: ٧٣١٠، انظر: «صحيح الترغيب والترهيب»: ٢٢٥٣.
(٢) أخرجه مُسْلِم: ٢٨٦٥.
(٣) أخرجه التِرْمِذِيُّ: ٢٤٠٧، انظر: «صحيح الجامع»: ٣٥١.

**واته: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو بەیانیەك كە ڕۆژ دەبێتەوە گشت ئەندامەكانی مرۆڤ زمان ئامۆژگاری دەكەن و پێی دەڵێن: لە خوا بترسە دەربارەی ئێمە، چونكە ئێمە پەیوەستین بە تۆوە، ئەگەر تۆ ڕاستبی ئەوە ئێمەش ڕاست دەبین، وە ئەگەر تۆ خوارو ناڕاستبی ئەوە ئێمەش خوارو ناڕاست دەبین.**

**١٧٢-** {عَنْ هَانِيء بْنِ يَزِيد ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ ﷺ! أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ يُوجِبُ لِي الجَنَّةَ؟ قَالَ: «عَلَيْك بِحُسْنِ الكَلاَمُ، وَبَذْلِ الطَّعَامِ»}[١].

**واته: هانیئی كوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هەواڵم پێ بدە بە شتێك كە بیكەم و بەهەشتم بۆ پێویست بێ؟ ئەویش فەرمووی: دەست بگرە بە قسەی چاك و خۆراك بەخشین (بەخشەربە).**

**١٧٣-** {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنْ النَّارِ، وَيَدْخُلَ الْجَنَّةَ فَلْتُدْرِكْهُ مَنِيَّتُهُ، وَهُوَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَيَأْتِي إِلَى النَّاسِ مَا يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إِلَيْهِ»}[٢].

**واته: عەبدوڵلای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك حەز دەكات لە ئاگر دووربخرێتەوەو بچێتە بەهەشتەوە، با لەو كاتەی مردنی بۆ دێ حاڵی وابێ بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێت، وە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵكیدا بكات، كە پێی خۆشە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت.**

**١٧٤-** {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ ﷺ، عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ وَلاَ: لِمَ صَنَعْتَ وَلاَ: أَلاَ صَنَعْتَ}[٣].

---

(١) أخرجه البُخَارِي في «الأدب المفرد»: ٨١١، انظر: «الصحيحة»: ١٩٣٩.

(٢) أخرجه أحمد: ٦٨٠٧ قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ١٤٠٠، وَمُسْلِم: ٢٤٧١.

**واتە: ئەنەس ﷺ، دەڵێ: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ کرد، نە پێی گوتم: ئۆف!! وە نە پێی گوتم: بۆ ئەم کارەت کردوە (ئەگەر کارێکم کردبا لە بەرژەوەندی ئەو نەبووایە)؟ وە نە پێی گوتم: بۆ ئەم کارەت نەکردوە (ئەگەر پێی ڕاسپاردبام)؟**

**١٧٥-** {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الحَيَاءُ وَالعِيُّ: شُعْبَتَانِ مِنَ الإِيْمَانِ، وَالبَذَاءُ وَالبَيَانُ: شُعْبَتَانِ مِنَ النِّفَاقِ»}[١].

**واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرمنی و کەم قسە کردن: دوو بەشن لە ئیمان، وە زمان پیسیی و زمان لووسیش: دوو بەشن لە نیفاق و دووڕوویی.**

**١٧٦-** {عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ»}[٢].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: هیچ شتێك لە چاکەکردن بە کەم مەزانە، هەرچەندە ئەگەر تۆ بگەیە برای خۆت بە ڕوویەکی گەش و خۆشەوە (لەوەشدا چاکەت بۆ دەنووسرێ).**

**١٧٧-** {عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَظَمَ غَيْظاً، وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ، دَعَاهُ اللهُ عَلَى رُؤُوسِ الخَلاَئِقِ يَوْمَ القِيَامَةِ، حَتَّى يُخَيِّرُهُ فِي أَيِّ الْحُورِ شَاءَ»}[٣].

**واتە: موعازی کوڕی ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك تووڕەیی خۆی قوتداتەوەو دەرینەبڕێ، لە کاتێکدا بشتوانێ دەری ببڕێ، ئەوە لە ڕۆژی دوایی لە نێو هەموو دروستکراوەکان خوا**

---

(١) أخرجه أَحْمَد: ٢٢٣٦٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح دون قوله: والعي والبيان.

(٢) أخرجه مُسْلِم: ٦٨٥٧.

(٣) أخرجه التِرْمِذِيّ: ٢٤٩٣، انظر: (صحيح إبن ماجه»): ٣٣٧٥.

بانگی دەکاو سەرپشکی دەکات، هەتا بە ئارەزووی خۆی کام حۆری بیەوێ هەڵیبژێرێ بۆ خۆی.

تێبینی: مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەو کەسەی زاڵە بەسەر نەفسی خۆی و ناکەوێتە ژێر کاریگەری نەفسی ئەوە کەسێکی ستایش کراوە، بۆیە لە ڕۆژی دوایی خوا لەبەر چاوی هەموو دروستکراوەکان ئەو کەسانە دێنێتە دەرو باسیان دەکات و مەدحیان دەکات، وە شانازیان پێوە دەکات کە بەندەی وای هەبووە هێندە زاڵ بووەو زۆر زوو تووڕە بوون، جا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم کەسە بەهەشتیەو دەچێتە بەهەشت لەوێ سەر پشك دەکرێ کام حۆری دەوێ، داوای بکات، بەڵام قووتدانەوەی تووڕەیی تەنها کاتێك باشە کە زیاتر بۆ بەرگری کردن لە نەفسی خۆمان بێت.

ئایا پێغەمبەری خوا تووڕە بووە؟ چۆن تووڕە بووە؟ وە لەبەر چی تووڕە بووە؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە با گوێ لە دایکمان عائیشە خان خوا لێی ڕازی بێ بگرین، دەفەرموێ: «وَاللَّهِ مَا انْتَقَمَ لِنَفْسِهِ فِي شَيْءٍ يُؤْتَى إِلَيْهِ قَطُّ حَتَّى تُنْتَهَكَ حُرُمَاتُ اللَّهِ، فَيَنْتَقِمُ لِلَّهِ»[1]، واتە: وەڵلاهی هەرگیز پێغەمبەری خوا لەبەر خودی خۆی تووڕە نەبووەو تۆڵەی نەسەندۆتەوە، مەگەر لەبەر ئەوەی سنووری قەدەغەکراوەکانی خوا شکێنرابێ و تۆڵەی بۆ دینی خوا سەندبێتەوە.

لە کۆتایی ئاماژە بەم قسە جوانەی پێشەوا شافیعی دەکەم کە دەڵێ: (مَنِ اسْتُغْضِبَ فَلَمْ يَغْضَبْ فَهُوَ حِمَارٌ، وَمَنْ اسْتُرْضِيَ فَلَمْ يَرْضَ فَهُوَ شَيْطَانٌ)[2]، واتە: هەر کەسێك تووڕە بکرێ و پێویست بکات تووڕە بێ، ئەویش تووڕە نەبێ ئەوە گوێ درێژە، وە هەر کەسێك ڕازی بکرێ و (ئەوەی دەیەوێ پێی بدرێ) ڕازیش نەبێ ئەوە شەیتانە!!

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٦٢٨٨.

(٢) سير أعلام النبلاء، ج١٠، ص٤٢.

**کەسمان گومانمان لەوە نیە پێغەمبەری خوا تووڕە بووە، وە خوای پەروەردگاریش مەدحی ئەو کەسانەی نەکردوە تووڕە نابن، بەڵکو مەدحی ئەو کەسانەی کردوە کە تووڕە دەبن تووڕەییەکەیان قوتدەدەنەوە، وەك دەفەرموێ:** ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ ١٣٤﴾ آل عمران، **واتە: وە قوتدەرەوانی ڕق و تووڕەیی.**

**١٧٨-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا زَارَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَجَلَس عِنْدَهُ، فَلاَ يَقُومَنَّ حَتَّى يَسْتَأْذِنَهُ»}[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان سەردانی برایەکی خۆی کردو لە لای دانیشت، با هەڵنەستێ تا مۆڵەتی لـێ وەردەگرێ.**

**١٧٩-** {عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ، مَا يُحِبُّ لِنَفسِهِ»}[٢].

**واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ براو (خوشکی مسوڵمانیشی) پێی خۆش نەبێ.**

**١٨٠-** {عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَذَكَرَ الصَّدَقَةَ وَالتَّعَفُّفَ وَالْمَسْأَلَةَ: «الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنْ الْيَدِ السُّفْلَى، فَالْيَدُ الْعُلْيَا هِيَ الْمُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى هِيَ السَّائِلَةُ»}[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر بوو باسی خێر کردن و خۆ پاراستن لە داواکردن و دەرۆزە**

---

**(١) أخرجه الدَّيْلَمِي: ١٢٠٠، انظر: «الصحيحة»: ١٨٢.**

**(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ٢١٨٧.**

**(٣) أخرجه البُخَارِيّ: ١٤٢٩، وَمُسْلِم: ١٠٣٣.**

کردنی کرد، فەرمووی: دەستی بەرز باشترە لە دەستی نزم، دەستی بەرز ئەو دەستەیە کە دەبەخشێت، وە دەستی نزم ئەو دەستەیە کە سواڵ دەکات و داوا دەکات.

## هەندێ لە نیشانەکانی ڕەوشت جوانی مرۆڤ (عَلاَمَات حُسْنُ الْخُلُق)

ئێستاش ئاماژە بە هەندێك لە نیشانەکانی ڕەوشت جوانی (حُسْنُ الْخُلُق) دەکەین، بۆ سوودو بەرچاوڕوونیی زیاترو خۆڕازاندنەوەی باشتر، کە خاوەنی کتێبی: (إحياء علوم الدّين) هێناویەتی:

١- «كَثِيرُ الْحَيَاءِ»: زۆر بە شەرم و حەیایی.

٢- «عَدَمُ الأذَى»: ئازار نەبوون بۆ خەڵك.

٣- «كَثِيرُ الإِصْلاَحِ»: زۆر ئەنجامدانی چاکەکاری و ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك.

٤- «صَدُوق اللِّسَانِ»: ڕاستگۆیی لە کاتی قسە کردن.

٥- «قَلِيل الْكَلاَمِ»: کەم قسە کردن.

٦- «كَثِيرُ الْعَمَل»: زۆر ئەنجامدانی کردەوەی چاك.

٧- «قَلِيل الزَّلَل»: کەم هەڵخیلسکان و هەڵە کردن (لە کردارو گوفتار).

٨- «وَقُوراً صَبُوراً»: گران و سەنگینی و ئارامگریی.

١٠- «شَكُوراً رَضِيّاً»: سوپاسگوزاریی و ڕازی بوون بە هەموو نیعمەتەکان.

١١- «حَلِيماً رَفِيقاً»: هێدیی و مەندی و نەرم و نیانی.

١٢- «عَفِيفاً»: داوێن پاکی.

١٣- «شَفِيقاً»: بە سۆزیی و پەرۆشیی.

١٤- «لا لَعَانَاً وَلاَ سَبَّابَاً»: نەفرەت نەکردن و جنێو نەدان.

١٥- «وَلاَ نَمَّامَـاً»: قسە نەهێنان و نەبردن لە نێوان خەڵکی بۆ ئاشووب نانەوە.

١٦- «وَلاَ مُغتَابـَاً»: باس نەکردنی خەڵك لە پاشملە کە پێیان ناخۆشبێ.

١٧- «وَلاَ عَجُـولاً»: زۆر پەلە پەل نەکردن.

١٨- «وَلاَ حَقُـوداً»: نەبوونی ڕق و کینە لە دڵ و دەروون.

١٩- «وَلاَ بَخِيـلاً»: ڕەزیل و چرووك نەبوون.

٢٠- «وَلاَ حَسُودَاً»: نەبوونی حەسوودیی.

٢١- «بَشَّاشَاً هَشَّاشَاً»: هەمیشە زەردەخەنە لەسەر لێوو ڕووخۆشیی.

٢٢- «يُحِبُّ فِي اللّهِ»: خۆشویستن لەبەر خوابێ و بەس.

٢٣- «يُبْغِضُ فِي اللّهِ»: ڕق لێبونەوە لەبەر خوابێ و بەس.

٢٤- «أَدَاءُ الأَمَانَةِ»: دانەوەی ئەمانەت و دەست پاكی.

٢٥- «إِعْطاءُ السَّائِلِ»: بەخشین لە کاتی داوا لێکران لەلایەن کەسی موحتاج.

٢٦- «صِيلَةُ الرَّحِم»: بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی.

٢٧- «قِرَى الضَّيْفِ»: ڕێزگرتنی میوان.

وە (ابْنُ حَجَر العَسْقَلَانِي) لە (فَتْحُ البَاري) ڕەوشتە جوان و پەسندەکانی بە شێوازێکی زۆر جوان تەرتیب کردوەو سەر ژمێری کردوون، وە گەیاندوونی بە شەست و نۆ سیفەت بەم شێوەیە:

## سیفەتەکانی پەیوەستن بە زمان

١- بە قسە گوتنی وشەی تەوحید، واتە: (لا إِلَه إلاَّ اللّه).

٢- خوێندنەوەی قورئان.

٣- فێربوونی زانیاریی و زانست.

٤- (خەڵك) فێری زانیاریی و زانست کردن.

٥- پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار.

٦- زیکری خوا، کە داوای لێ خۆشبوونیش دەگرێتەوە.

٧- خۆ پاراستن لە گوتنی قسەی زیادو بێ سوود.

## سیفەتەکانی پەیوەستن بە جەستە

١- خۆ پاککردنەوەی هەست پێکراوو، واتە: لە ڕووی ئەحکامی شەرعیی، وە خۆ پاراستن لە پیسیەکان دەگرێتەوە.

٢- داپۆشتنی عەیبەو شەرمگە.

٣- ئەنجامدانی نوێژە فەڕزو سوننەتەکان.

٤- هەروەها زەکات دان.

٥- ئازاد کردنی کۆیلە.

٦- سەخاوەتی، کە نان‌دان و ڕێزگرتنی میوان دەگرێتە خۆی.

٧- ڕۆژووە فەڕزو سوننەتەکان.

٨- هەروەها ئەنجامدانی حەج و عومرە.

٩- سووڕانەوە بە دەوری کەعبە.

١٠- مانەوە لە مزگەوت بۆ خواپەرستی.

١١- گەڕان بە دوای شەوی قەدر، لە شەوانی ڕەمەزان.

١٢- ڕاکردن و هەڵاتن بە هۆی دینەوە، کە دیارە کۆچکردن لە شوێنی شیرك بۆ شوێنی خواپەرستی دەگرێتەوە.

١٣- وەفاکردن بە نەزر، یانی کە بەڵێنی بە خوا دا نەزر بکات، ئەنجامی بدات.

١٤- گەڕان بە دوای ئیمان، لەبەر ئەوەی ئیمان زیادو کەم دەکات ئینسان هەمیشە دەبێ هەوڵبدات هۆکارەکانی زیاد بوونی ئیمان بە دەست بێنێ.

١٥- کە کەفارەتی دەکەوێتە سەر بیدات، وەك: کەفارەتی ڕۆژوو، کەفارەتی سوێندو..

## شەش سیفەت تایبەتن بە گوێڕایەڵی

١- خۆپاك ڕاگرتن بە هۆی نیکاحەوە، وە هەڵسان بە ئەنجامدانی هەقی ماڵ و خێزان.

٢- چاك بوون لەگەڵ دایك و باوك، وە خۆ دوورگرتن لە خراپ بوون لەگەڵیان.

٣- باش پەروەردەکردنی منداڵ.

٤- بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی.

٥- گوێڕایەڵی کردنی برا گەورە.

٦- بەبەزیی و نەرم و نیان بوون لەگەڵ کۆیلەو خزمەتکار.

## سیفەتە گشتیەکان

١- هەڵسان بە ئەنجامدانی کاروباری خەڵك بە دادگەریی.

٢- هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵ و تاقم دابوون، واتە: خۆ دوورگرتن لە بە تەنیا کارکردن، (چونکە دیارە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە لە مێگەل دادەبڕێ).

٣- گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستان (لە شتی باش).

٤- ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك.

٥- هاوکاری یەکدی کردن لەسەر چاکە، کە ئەوەش فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەگرێتەوە.

٦- جێبەجێ کردنی سنوورەکانی خوا، یاسا شەرعییەکان.

٧- جەنگ و جیهاد کردن لە پێناوی خوا، کە ڕاوەستاوی لە جەنگیش دەگرێتە خۆی، (مُرَابَطَة) وەك (مُحَافَظَة) وایە، واتە: پارێزگاریی لێکردن و مانەوە لە شوێنی خۆ.

٨- تەسلیم کردنەوەی ئەمانەت و سپاردە.

٩- قەرزدان، وە وەفا پێکردنی (وە سوپاس کردنی خاوەن قەرز).

٢٠- ڕێزگرتن و باش بوون لەگەڵ دراوسێ.

٢١- جوان هەڵسوکەوت کردن لە مامەڵەدا.

٢٢- کۆکردنەوەی ماڵ بە ڕێگەیەکی حەلاڵ، وە خەرج کردنیشی بە شێوەیەکی شایستەو زێدەڕۆیی و نەکردن تێیداو چرووکی نەکردن لە خەرج کردنیدا.

٢٣- وەڵامدانەوەی سەلام.

٢٤- کەسێك کە بژمی و گوتی: (الْحَمْدُ لله) پێی بڵێی: (يَرْحَمُكَ اللّه).

٢٥- دەست گرتنەوە لە ئەزیەتدانی خەڵك.

٢٦- خۆ دوورگرتن لە قسەی ناشیرین.

٢٧- لادانی ئەزیەت و ئازار لەسەر ڕێی خەڵکی.

## دەربارەی: فەرموودە قودسیەکان

(الحَديثُ القُدْسِيّ): بریتیە لەو فەرموودانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە خوای پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، جا هەر بێژەو لەفزەکە هی خوا بێ، یان تەنیا ماناکەی هی خوا بێت، بەڵام جگە لە قورئان، واتە: قورئان و فەرموودەی قودسی هەردووکیان هی خوای پەروەردگارن، لەگەڵ هەبوونی ئەو جیاوازیانەی خوارەوە:

## جیاوازی نێوان قورئان و فەرموودەی قودسی:

١- قورئان هەمووی لە ڕێی جبریل (علیه السلام)ەوە هاتوە، بەڵام فەرموودەی قودسی جاری وایە جبریل هێناویەتی، جاروایش هەبووە خوا ئیلهامی دڵی پێغەمبەری کردوەو خستوویەتیە دڵی موبارەکی.

٢- قورئان موتەواتیرە[1]، واتە: دڵنیایی و یەقینمان هەیە، هەمووی تەواوەو ڕاستە لە خواوەیە، بەڵام فەرموودەی قودسی هەیە ڕاستە، هەیە لاوازە، هەیە هەڵبەستراوە، کەواتە: هەموو فەرموودەیەکی قودسی صەحیح نیە.

---

(١) المتواترُ: ما أخرجه جماعة في كُل طبقة من طبقات السَّنَد تَحيلُ تواطؤهم وتوافقهم على الكذب واستندوا إلى أمرٍ مَحسوس.

٣- قورئان دابەش کراوە بۆ چەند سوورەت و ئایەت و حزب و بەشێك، بەڵام فەرموودەی قودسی وا نیە.

٤- قورئان لە ناو نوێژ دەخوێنرێ، بەڵام دروستە نیە فەرموودەی قودسی لە ناو نوێژ بخوێنرێ.

٥- پاداشتی خوێندنەوەی قورئان شتێکی جێگیرو سەلمێنراوە، بەڵام فەرموودەی قودسی هەمان فەزڵ و پلەو پاداشتی نیە.

٦- قورئان موعجیزەیەکی دەستەوسانکەرە بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین دەمێنێتەوە هەتا دونیا مابێ، بەڵام فەرموودەی قودسی موعجیزەو دەستەوسانکەر نیە.

٧- بڕوا نەبوون بە قورئان کوفرە، خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەچێتە دەر، بەڵام بڕوا نەبوون بە فەرموودەیەکی قودسی بە هۆی ئەوەی کە لاوازە نەك کوفر نیە، بەڵکو ئاساییە، (هەروەك زۆر فەرموودەی قودسی هەن کە لاوازن، لە ڕووی سەنەدەوە ناگەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ).

٨- دروست نیە قورئان بە مانا بگێڕدرێتەوە، بەڵام دروستە فەرموودەی قودسی بە مانا بگێڕدرێتەوە.

بەڕێـــزان!

دیارە ئەم دە (١٠) فەرموودەی سەرەتا لە ئەسڵدا بە یەك ڕیوایەت ئیمام موسلیم لە کتێبە صەحیحەکەی بە ژمارە (٦٧٣٧) لە باسی (باب: تحريم الظلم) ئاوا بەو شێوە هێناویەتی: {عَنْ أَبِي ذَرٍّ عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فِيمَا رَوَى عَنِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ: يا عبادي ...}، بەڵام بۆ ئاسانی لەبەر کردن، دابەشمان کرد بۆ چەند بڕگەیەك، کە هەر یەکەی بە شێوەی فەرموودەیەکی سەربەخۆ دەبینرێ:

١٨١- {«يَا عِبَادِي! إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً فَلاَ تَظَالَمُوا»}.

**ئەی بەندەکانم! من ستەمم لەسەر خۆم قەدەغە کردووەو لە نێو ئێوەشدا قەدەغەم کردووەو ستەم لە یەکدی مەکەن.**

١٨٢- {«يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ»}.

**ئەی بەندەکانم! هەر کامێك لە ئێوە گومڕایە مەگەر ئەوەی من بیخەمە سەر ڕێی ڕاست، جا داوای خستنە سەر ڕێی ڕاستم لێ بکەن بۆ ئەوەی بتانخەمە سەر ڕێی ڕاست.**

١٨٣- {«يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ»}.

**ئەی بەندەکانم! هەر کامێك لە ئێوە برسییە مەگەر ئەوەی من خواردنی پێ بدەم، جا داوای خواردنم لێ بکەن، بۆ ئەوەی خواردنتان پێ بدەم.**

١٨٤- {«يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ»}.

**ئەی بەندەکانم هەر کامێك لە ئێوە ڕووت و بێ پۆشاك دەبێ مەگەر ئەوەی من بیپۆشم، جا داوای پۆشاکم لێ بکەن، بۆ ئەوەی پۆشاکتان بکەمە بەر.**

١٨٥- {«يَا عِبَادي! إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ باللَّيلِ وَالنَّهارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعَاً فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ»}.

**ئەی بەندەکانم! ئێوە بە شەوو ڕۆژ هەڵە دەکەن و گوناهان دەکەن منیش لە هەموو گوناهان دەبورم، جا داوای لێبوردنم لێ بکەن بۆ ئەوەی لێتان ببورم.**

١٨٦- {«يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي فَأَعْطَيتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذلِكَ مِمَّا عِنْدِي، إِلاَّ كَمَا يَنْقصُ المِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ البَحْرَ»}.

ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوانەی پێشێتان و ئەوانەی دواییتان مرۆڤەکانتان و جنەکانتان هەموویان لە شوێنێك ڕابوەستن و داوام لێ بکەن، وە هەر کامێك لە ئێوە داواکەی بۆ جێبەجێ بکەم، ئەوە هیچ لەوەی کە لە لامە کەم ناکات، مەگەر ئەو ئەندازەیە کە دەرزیەك دەخرێتە نێو ئاوی دەریاوە چەندی لێ کەم دەکات.

١٨٧- {«يَا عِبَادي! إنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغوا ضُرِّي فَتَضُرُّوني، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفعِي فَتَنْفَعُوني»}.

ئەی بەندەکانم! ئێوە ناتوانن بگەنە ئاستێك کە زیان لە من بدەن، وە ناشتوانن بگەنە ئاستێك کە سوود بە من بگەیەنن.

١٨٨- {«يَا عِبَادي! لَوْ أنَّ أوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذلِكَ في مُلكِي شَيْئَاً»}.

ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوانەی پێشێتان و ئەوانەی دواییتان هەموو مرۆڤەکان و جنەکان لەسەر دڵی پارێزکارترین پیاو بن لە ئێوە، هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات.

١٨٩- {«يَا عِبَادي! لَوْ أنَّ أوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا نَقَصَ ذلِكَ من مُلكِي شَيْئَاً»}.

ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوانەی پێشێتان و ئەوانەی دواییتان مرڤەکانتان و جنەکانتان هەمووتان بە پێی دڵی تاوانبارترین پیاو بن، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات (چونکە موڵکی خوا جێگیرە، زیادو کەم ناکات).

١٩٠- {«يَا عِبَادي! إنَّمَا هِيَ أعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيراً فَلْيَحْمَدِ اللّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذلِكَ فَلا يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ»}.

واتە: ئەی بەندەکانم! تەنیا کردەوەکانی خۆتانتان دەژمێرم و سەر ژمێر دەکەم، وە دوایی پاداشتتان دەدەمەوە، یان سزاتان دەدەم بە پێی

کردەوەکانتان، جا هەر کەسێك چاکەی بینی با ستایشی خوا بکات، وە هەر کەسێك جیا لەوەی بینی، (واتە: سزای بینی، خراپەی بینی) با جگە لە خۆی لۆمەو سەرزەنشتی کەس نەکات.

١٩١- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﵁ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ! إِنْ صَبَرْتَ وَاحْتَسَبْتَ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى، لَمْ أَرْضَ لَكَ بِثَوَابٍ دُونَ الْجَنَّةِ»}[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای پاك فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم! ئەگەر ئارام بگری و چاوەڕێی پاداشت بکەی لە یەکەم ساتی موصیبەت و بەڵادا، ئەوە جگە لە بەهەشت بە هیچ پاداشتێکی دیکە ڕازی نابم بۆت.

١٩٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَسُبُّ ابْنُ آدَمَ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ بِيَدِيَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ»}[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: نەوەی ئادەم (مرۆڤ) جنێوو قسەی ناشرین بە ڕۆژگار دەدات، کەچی ڕۆژگاریش کە شەوو ڕۆژە بە دەست منە.

تێبینی: هەندێك لە ڕوونکەرەوانی فەرمووده گوتوویانە: خوا فەرموویەتی: من ڕۆژگارم، کەچی خەڵك جنێو بە ڕۆژگار دەڵێن، بەڵام بێگومان خوا مەبەستی ئەوە نیە، وە ڕۆژگار نە ناوێکی خواو نە سیفەتێکی خوای پەروەردگارە، بەڵکو خوا دەیەوێ: شتەکان بگێڕێتەوە بۆ لای دەستەڵاتی خۆی و خەڵك بزانن هەرچی ڕوو دەدات بە ئەندازەو تەقدیری خوایە، غەیری خوای پەروەردگار هیچ کەس هیچ شتێکی لە دەست نایەت.

---

(١) أخرجه إِبْنُ مَاجَه: ١٥٩٧، انظر: «صحيح إبن ماجه»: ١٢٩٨.
(٢) أخرجه مُسْلِم: ٥٩٩٩.

جگە ئەمە لە نێو عەرەب عادەتێکی سەردەمی نەفامی بووە، کە هەموو شتێکیان بۆ ڕۆژگار گێڕاوەتەوە، وەك خوا لەسەر زاری وان فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية، بەڵێ، لێرەدا وەك دەبینین خوا نەهیان لێ دەکات لە گوتنی ئەم قسەیەیان، وە پێغەمبەری خواش قەدەغەی کردووین کە قسەی وا بڵێین فەرموویەتی: «لاَ تَسُبُّوا الدَّهْر»[1]، واتە: جنێو بە ڕۆژگار مەڵێن. بۆچی؟ چونکە ئێمە ئەگەر جنێوو قسەی ناشرین بە ڕۆژگار بڵێین: بە هۆی ئەو ناخۆشی و نەخۆشی و ناڕەحەتیانەی تووشمان دەبێ، ئەوە بۆ پەروەردگاریش دەگەڕێتەوە، چونکە ئەوەی ئەو شتانە بەسەر ڕۆژگار دێنێ، یان وا دەکات ئەو شتانە لە ڕۆژگار ڕووبدەن تەنیا خوای بێ هاوەڵە.

١٩٣- {عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللّٰهَ تَبَارَكَ وَتَعَالى يَقُولُ وَعِزَّتِي وَجَلَالِي لاَ أَجْمَعُ لِعَبْدِي أَبَدَاً أَمْنَيْنِ وَلاَ أَجْمَعُ لَهُ خَوْفَيْنِ إِنْ هُوَ أَمِنَنِي فِي الدُّنْيَا خَافَنِي يَوْمَ أَجْمَعُ فِيهِ عِبَادِي، وَإِنْ هُوَ خَافَنِي فِي الدُّنْيَا أَمَّنْتُهُ يَوْمَ أَجْمَعُ فِيهِ عِبَادِي»}[2].

واتە: شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالى) دەفەرموێ: سوێند بە عیززەت و گەورەیی خۆم دوو هێمنی و دوو ترس لە (دڵی) بەندەی خۆم کۆناکەمەوە، ئەگەر بەندە لە دونیا لێم نەترسا (سەرپێچی کردم)، لە ڕۆژی کۆکردنەوەی بەندەکانم لێم دەترسێ (کاتێ سزای دەدەم)، ئەگەر لە دونیاش لێم ترسا (گوێڕایەڵی کردم)، ئەوە لە ڕۆژی حەشرو کۆکردنەوەی بەندەکانم دڵنیایی پێ دەبەخشم (پاداشتی دەکەم).

---

(١) أخرجه مسلم: ٦٠٠٣.

(٢) أخرجه أبُو نعيم ج١، ص٢٧٠، انظر «الصحيحة»: ٧٤٢.

١٩٤- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَن النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَزَعَمَ أَنِّي لاَ أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كَمَا كَانَ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ، فَقَوْلُهُ: لِي وَلَدٌ فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَوْ وَلَداً»}[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرز فەرمووی: ئادەمیزاد منی بە درۆزانی، درۆکردنی پاڵدایە لای من ئەوەشی بۆ نەبوو، وە جنێوی پێدام و ئەوەشی بۆ نەبوو، (نەدەبوو وابکات)، جا لەوەی کەمنی بە درۆزانیوە ئەوەیە کە گومانی وابووە من ناتوانم زیندووی بکەمەوەو ژیانی پێ ببەخشم وەك جاران (لە حاڵێکدا کە من هەواڵم پێداوە زیندووی دەکەمەوە، مانای وایە منی بە درۆزانیوە)، وە جنێودانەکەشی بە من ئەوەیە کە گوتوویەتی: من ڕۆڵەو منداڵم هەیە پاکی بۆ من کە هاوسەرم هەبێت، یاخود منداڵم هەبێ.**

١٩٥- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ اللّهَ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ يَقُولُونَ: لَبَّيْكَ، رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا لَنَا لاَ نَرْضى، وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ قَالُوا: يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً»}[2].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا بە خەڵکی بەهەشت دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! دەڵێن: لە خزمەت داین ئەی پەروەردگارمان، بۆ هەر شتێك جێگای ڕەزامەندی تۆ بێ ئامادەین، خوا دەفەرموێ: ئایا ڕازی بوون، خۆش حاڵ بوون بەوەی کە پێم داون؟ دەڵێن: جا بۆ ڕازی نەبین لە کاتێکدا شتێکت بە ئێمە داوە،**

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٤٤٨٢.

(٢) أخرجه البُخَارِيّ: ٦١٨٣، وَمُسْلِم: ٢٨٢٩.

که به هیچ کام له دروستکراوەکانی خۆتت نەداوه، خوا دەفەرموێ: باشتر لەوەی پێم داون پێتان دەدەم! ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار! جا چ شتێك لەوەی پێتداوین باشتره، دەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆمتان بەسەردا دەڕێژم که له دوای ئەمه هەرگیز لێتان تووڕه نابم.

١٩٦- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ قَالَ: وَعِزَّتِكَ يَا رَبِّ لاَ أَبْرَحُ أُغْوِي عِبَادَكَ مَا دَامَتْ أَرْوَاحُهُمْ فِي أَجْسَادِهِمْ، فَقَالَ الرَّبُّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: وَعِزَّتِي وَجَلاَلِي لاَ أَزَلُ أَغْفِرُ لَهُمْ مَا اسْتَغْفَرُونِي»}[١].

واته: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان گوتی: سوێند به عیززەتت ئەی پەروەردگارم دەست هەڵناگرم له گومڕاو سەرگەردان کردنی بەندەکانت، هەتاکو ڕووح له جەستەیان دا مابێت، پەروەردگار (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) فەرمووی: به عیززەت و به گەورەیی خۆم منیش بەردەوام لێیان دەبوورم و لێیان خۆش دەبم، مادەم داوای لێبوردن و لێخۆشبوونم لێ بکەن.

١٩٧- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ رَبَّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ! بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرُ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ وَالصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ»}[٢].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی پەروەردگارتان دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم به هەر چاکەیەك ده چاکه تا حەوت سەدو چەند قات زیاترت (پاداشت) بۆ دەنووسرێ، وه ڕۆژوو بۆ منەو تەنها خۆشم پاداشتی خاوەنەکەی دەدەمەوه (واته: نووسینی ژمارەی پاداشتەکەی له دەست فریشتەکان نیه، خۆم بۆیان دەنووسم، که ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەره لەگەڵ شەڕەفی نوسینەکه لەلایەن پەروەردگار، جا دەبێ کەسێك بچێته ئاگر که خوای پەروەردگار خۆی پاداشتی بۆ نووسی بێ؟!).

---

(١) أخرجه أحمد: ١١٢٥٥، انظر: «الصحيحة»: ١٠٤.

(٢) أخرجه أحمد: ٩٣٥٢، وَصَحَّحَهُ شُيَعب الأرنؤوط.

١٩٨- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ يَوْمَ القِيَامَةِ: أَيْنَ المُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي؟ اليَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي»}[1].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای بەرز لە ڕۆژی دوایی دەفەرموێ: کوان ئەوانەی لەبەر گەورەیی من یەکدیان خۆش دەویست؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەری (عەڕشی) خۆم، کە جگە لە سێبەری (عەڕشی) من هیچ سێبەرێك نیە.**

١٩٩- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي أَمْلأْ صَدْرَكَ غِنًى، وَأَسُدَّ فَقْرَكَ وَإِلاَّ تَفْعَلْ مَلأْتُ يَدَيْكَ شُغْلاً، وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ»}[2].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی خوای بەرز دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم! خۆت یەکلابکەوە بۆ بەندایەتی کردنم، دڵت پڕ دەکەم لە دەوڵەمەندی و، ڕێی هەژاریت لێ دادەخەم، وە ئەگەر وا نەکەی، زۆر سەرقاڵت دەکەم بە ئیش و کار، وە ڕێی هەژاریشت لێ داناخەم.**

٢٠٠- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: سَبَقَتْ رَحْمَتِي غَضَبِي»}[3].

**واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خوا فەرموویەتی:) ڕەحمەت و بەزەییم پێش تووڕەییم کەوتۆتەوە.**

---

(١) أخرجه مُسْلِم: ٦٧١٣.

(٢) أخرجه التِرْمِذِيّ: ٢٤٦٦ انظر: «الصحيحة» رقم: ١٣٥٩.

(٣) أخرجه مُسْلِم: ٧١٤٦، وَفِي رِوَايَةٍ أُخْرَى عَنْ هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَاباً قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الْخَلْقَ إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي فَهُوَ مَكْتُوبٌ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ. صحيح البخاري: ٧١١٥.

# نێوەڕۆك



فەرموودەی پێغەمبەر 

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێکردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەرزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره».

لەم فەرموودە دووعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.




■ 07504671394 - 07824671394
■ فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
■ هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری



کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە